پرۆژەی تیشک

٨




# بەجیهانیکردن

## دیدێکی ئیسلامیی

نووسینی:

د. موحسین عەبدولحەمید

وەرگێڕانی:

حەمە کەریم عەبدوڵا

## ناوەڕۆك( ژمارەكانی لا پەڕەكان هی كتێبە چاپكراوەكەن )

## بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## پێشەکی

سوپاس بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکان و دروودو سڵاو لەسەر دوایین پێغەمبەرو ڕەوانەکراو, پێشەوای گەورەمان موحەممەدو لەسەر خزمانی و هاوەڵانی و شوێنکەوتوانی بە چاکە تا ڕۆژی قیامەت.

خوای گەورە بەڵێنی وەرگرتووە لە زانایان و بانگخوازان, کە بە دڵسۆزانە ڕاستییەکانی ئایین بۆ خەڵکی ڕوون بکەنەوە, فەرمان بە چاکەو بەرگریی لە خراپە بکەن, ئەوەی خوا فەرمانی کردووە بە گەیاندنی بە خەڵکی، هیچی لێنەشارنەوە. چونکە ئەوان پارێزەری بیروباوەڕو شەریعەت و ڕەوشتی ئومەتن کە خوای گەورە ڕازی بووە لەسەری.

بەوپێیە زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە ڕاهاتوون هەر لە سەردەمی هاوەڵانی بەڕێزەوە, بەردەوام ڕاستییەکانی ئاینیان ڕوونکردۆتەوەو بەرگرییان لە نیشتمان و ئوممەت کردووە, لە کاتێکدا ڕاوەستاون بەرامبەر بە شێواندن و گۆڕانکاریی و لادان. خوانەناسەکان, کاهینی بیرە دەستکردەکان, لاهوتەکانی دینە شێواوەکان لە هەوڵدا بوون بۆ تێکدانی ئایینی ڕاستەقینەی خوا, بەڵام زانایان توانیان شکستیان پێبێنن, ئیسلامیان ڕزگار کرد لە پاشەڕۆکی ئەو هێرشە ڕێکخراوانە, بە پاکی و ڕوونی هێشتیانەوە, چەندەها کتێب و نامیلکەیان لەسەر نووسی کە دەتوانی دیواری کتێبخانەیەکی گەورەیان پێ بڕازێنیتەوە.

لە کاتێکدا لەم سەردەمە نوێیەدا, موسڵمانان ڕووبەڕووی هێرشێکی فیکریی بەلێشاوو گشتگیر بوونەوە, لەلایەن خوانەناسانی داگیرکەرەوە بە مەبەستی لەناوبردنی بنەماکانی ئیسلام, زانایانی ئیسلام چاکی مەردایەتیان کرد بەلاداو, هاتنە گۆڕپانی خەباتەوەو, ئەو درۆو دەلەسانەیان بە بەڵگەو سەلماندنی ڕوونەوە ڕەتکردەوە, بەوەش نەوە نوێکانیان لە هێرشی ماددیەکان و بێ ئابڕووەکان(اباحيين) ڕزگار کرد, کە خەریك بوو هەرچی پیرۆزیی و جوانیی ئەم ئوممەتە هەیە هەمووی پێشێل بکەن.

بەڵام بەرنامەی ڕۆژهەڵاتناسان و هێرشە گەورەکانی مژدەدەران و فەلسەفە مادیە خوانەناسەکان, سوپاس بۆ خوا, نەیانتوانی هیچ کارێك بکەنە سەر ئیسلام و دەست بوەشێنن لە شارستانیەتە مرۆڤایەتییە گەشاوە مرۆڤدۆستەکەی, بەو شێوەیە هەوڵەکانیان بە باچوو بەرامبەر بە بەهێزیی و ڕوونیی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەرو(درودی خوای لەسەر بێت) ئەوەی موسڵمانان بنیاتیاننا بە هەوڵی دوورو درێژیان, لە زانست و زانیارییە سوودمەندەکان و, دەستکەوتە شارستانییە دیارەکان.

ئەمڕۆش ڕۆژئاوای قین لەدڵ, بە سەرۆکایەتی ئەمریکای زایۆنی, دەیەوێت بە شێوازی شەیتانیانەی نوێی هەڵخەڵەتێنەر, جیهان داگیربکات, بەوەی ناویان ناوە (بەجیهانیکردن). ئەویش دەیەوێت دەستبگرێت بە سەر وڵاتانی موسڵماندا و, سامانەکانیان و ئایینەکەیان و سیستمی ژیانیان بشێوێنێت و دژایەتی ڕەوشتە بەرزەکانیان بکات, بە بەرەڵاییەکی(اباحية)ی نوێ کە کۆنگرە لەدوای کۆنگرەی بۆ دەبەستن لە سایەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا, کە دەوڵەتانی ستەمکار دایان مەزراند بە هاوکاریی یەهودیەتی جیهانی, بۆ ملکەچکردنی گەلانی هەژارو, تاڵانکردنی سامانەکانیان و, لە ناوبردنی تەواوی ڕۆشنبیریی و شارستانیەتە دێرینەکەی, لە ڕوانگەی بە مەزن کردنی شارستانییەتی ماددی نوێ, کە دژایەتی ئایینەکان دەکات و تایبەتمەندیی میللەتانیش لەگەڵ ڕۆشنبیریە کۆمەڵایەتییەکانی و بەها شارستانییەکانی دەسڕێتەوە.

زۆر لە نووسەران و توێژەرانی پسپۆڕی موسڵمان, لەسەر مەترسیی بەجیهانیکردنیان نووسیوە, باسیان لە کاریگەریی بۆ داهاتووی گەلان کردووە, بە تایبەتی گەلانی موسڵمان, لایەنە خراپە کوشندەکانیان و نەخشە دۆزەخیەکانیان بۆ قوتدانی ڕەسەنایەتی گەلان و بەرژەوەندیە ڕەواکانیان ڕوون کردۆتەوە, بەڵام کەمێك لەوان پەلیان هاویشتووە, بۆ هەڵوێستی ئیسلام بەرامبەر بەو هێرشە پڕمەترسیە, لێرەدا من لەم توێژینەوەیەم دەمەوێت بە پشتیوانی خوا ئەگەر لایەنێکی بچوکی ئەو مەترسیەش بێت پڕی بکەمەوە, پاش ئەوەی هەرچی کتێب و, توێژینەوەی زانستیم لە بارەی بابەتی (بە جیهانیکردنەوە) دەسکەوتبێ هەموویم خوێندۆتەوە, هەروەها دوای ئەوەی گومانم نەما کە ئوممەتی ئیسلامیی ئەگەر خۆی بدات بە دەستەوە ئەوە خۆی دەکوژێت لە ڕووی ڕەوشت و شارستانیەتەوە، ئەگەر نەخشەی ئیمانیی و زانستی و واقیعیی بۆ ئامادە نەکات, بۆ بەرگریی لە گومڕاییەکانی و, گەیشتن بە دۆخێکی هاوسەنگی بە سوود لە گەڵیاندا. دوایین پاڕانەوەشمان سوپاس بۆ خوای میهرەبان.

# بەشی یەکەم

## بەجیهانیکردن لە نێوان جیهانیی‌و بەجیهانیکردندا

جیاوازیەکی زۆر هەیە لە نێوان ئەو دوو زاراوەیەدا, جیهانیی‌و بەجیهانیکردن. زاراوەی یەکەم واتە: ڕۆڵەکانی ئەم جیهانە بە جیاوازی خێڵ‌و گەلان‌و زمان‌و میللەتانەوە, هەموویان لە سەر ئەم زەوییە دەژین, هەندێکیان تێکەڵ بەهەندێکیان دەبن. هیچ ڕێگریێکیش نییە کە گەلێك لە گەلێکی‌تر سوود وەربگرێت, ناشبێ هەندێکیان ئایین, یا زمان, یا بنەماو هاوسەنگیی سیاسیی‌و سیستمی ئابووریی‌و کۆمەڵایەتی خۆی بسەپێنی بەسەر هەندێکی ترياندا. جیاوازی لەو چوارچێوەیەدا شتێکی سروشتییە, هاوکاریی لەگەڵ ئەو جیاوازییەدا زۆر پێویستە, بۆ ڕێگرتن لە پێکدادان‌و, جەنگ‌و دوژمنکاریی, ئەو پرۆسە جیهانییە لەوانەیە پێی بوترێت (ڕۆشنبیرکردنی‌شارستانیی) لە نێوان گەلان‌و میللەتاندا. ئەوەش واقیعی مرۆڤایەتی بووە لە کۆنترین سەردەمەوە تا ئەمڕۆ. زمانەکان موتوربە کراون, کۆمەڵگاکان هاوکاریی یەکتریان کردووە, شارستانیەتەکان لە شوێنێکەوە پەڕیونەتەوە بۆ شوێنێکی تر.

ئەو جەنگ‌و ستەمکارییانەی کە ڕوویانداوە, دەکرێ ڕوشبدات لە نێوان ڕۆڵەکانی مرۆڤایەتیدا, ئەقڵی ساغ‌و بنەماکانی ئایینە ڕاستەقینەکان‌و بەرژەوەندیی هاوبەش ڕەتیدەکەنەوە. چونکە بەختیاریی مرۆڤایەتیی خۆی بۆ خۆی پێویستە. هاوکارییش لەسەر چاکە, لە نێواندا گەورەترین کاری باشە, کە بەها باڵاکانیان بڕیاری لەسەر دەدات‌و, هانی خەڵکی بۆ دەدات. مرۆڤەکانیش هەموو لەم ژیانەدا لەسەری کۆکن. ڕونترین نموونەش لەسەر ئەوە ئیسلامە. کاتێ دوا ئایین هات بۆ ڕێنمایی جیهانیان, بانگی خەڵکی کرد بۆ بیروباوەڕو شەریعەتەکەی‌و بەها ڕەوشتییەکانیی, لە ڕێگای بانگەوازی نەرموونیان‌و, وتووێژی زانستیی‌و عەقڵیی ساغەوە, بێ زۆر لێکردنی هیچ کەس, دانیشی ناوە بەو جیاوازییەی لەسەر زەویدا هەیە, لە ڕوانگەی قورئانەوە, وەکو فەرموویەتی (ولو شاء اللّٰه لجعلكم امة واحدة ولكن ليبلوكم في ما اتاكم فاستبقوا الخيرات الى اللّٰه مرجعكم جميعا فينبئكم بما كنتم فيه تختلفون) المائدة /٨٤ واتە: ئەگەر خوا بیویستایا هەمووتانی دەکرد بە یەك ئوممەت, بەڵام دەیەوێت تاقیتان بکاتەوە لەوەی کە بۆتان هاتووە, دە پێشبڕکێ لە چاکەدا بکەن, هەمووتان گەڕانەوەتان هەر بۆلای خوایەو ئەوکاتە ئاگادارتان دەکات لەوەی کە تیا جیاواز بوون.

(وقل للذين اوتوا الكتاب الاميين أأسلمتم فأن اسلموا فقد اهتدوا وان تولوا فانما عليك البلاغ) ال عمران/٢٠ واتە: ئەی پێغەمبەر بڵێ بە خاوەن کتێبە ئاسمانیەکانی ترو نەفامانی عەرەب ئایا موسڵمان بوون، ئەگەر موسڵمان بوون ئەوە ڕێگەی ڕاستتان گرتووە ئەگەر نا ئەوە ئێمە تەنها ئاگادارکردنەوەمان لەسەرە.

(لا اكراه في الدين قد تبين الرشد من الغى) البقرة/٢٥٦ واتە: زۆرلێکردن نیە لە ئاییندا ڕاستەو ناڕاستی دەرکەوتووە.

(لا ينهاكم اللّٰه عن الذين لم يقاتلونكم ولم يخرجوكم من دياركم أن تبروهم وتقسطوا اليهم ان اللّٰه يحب المقسطين) الممتحنة/٨ واتە, خوا ڕێگای ئەوەتان لێناگرێت کە لەگەڵ ئەوانەی جەنگیان لەگەڵدا نەکردوون‌و دژایەتی ئایینیان نەکردووە چاکڕەفتارو دادپەروەربن لە گەڵیاندا خوای گەورە دادپەروەرانی خۆشدەوێت.

(أفانت تكره الناس حتى يكونوا مؤمنين) يونس/٩٩ واتە: ئایا تۆ( ئەی پێغەمبەر) ڕەوایە زۆر لە خەڵك بکەیت بۆ ئەوەی باوەڕ بهێنن.

(قل يا ايها الناس قد جاءكم الحق من ربكم فمن اهتدى فانما يهتدى لنفسه ومن ضل فانما يضل عليها وما انا عليكم بوكيل) يونس١٠٨ واتە: ئەی خەڵکینە هەق‌و ڕاستیتان لای خواوە بۆ هاتووە ئەوەی ئەو ڕاستیە بگرێتە بەر ئەوە بۆ

خۆیەتی ئەوەش کە گومڕا دەبێت لەسەر خۆی دەکەوێت من چاودێر نیم بەسەر کرداری ئێوەوە.

ئەو ڕێنماییە خواییانە هەموویان لەسەر بنەمای (الحمد اللّهِ رب العالمین) الفاتحة /١ پەیدابوون کە ئەیفەرموو(رب العالمین) واتە: فەرموویەتی پەروەردگاری هەموو جیهانیان نەك تەنها موسڵمانان؟ چونکە جیهان شوێنی کارکردنی هەمووانە, نەك شوێنی لێپرسینەوە, بەڵکو لێپرسینەوە لە ڕۆژی قیامەتدایە, خوای گەورە فەرموویەتی: (ومن يبتغ غير الاسلام دينا فلن يقبل منه وهو في الاخرة من الخاسرين ) واتە: هەرکەس جگە لە ئیسلام ئاینێکی تری بوێت لێیوەرناگیرێت‌و لە ڕۆژی قیامەتدا زیانمەندە.

ئەوەش مێژووی مرۆڤایەتی, بە تایبەتی مێژووی ئیسلام, بەڵگەیەکی تێدا نییە لە سەر ئەوەی کە موسڵمانان نەخشەی یەك ڕێگاو یەك ئاراستەو یەك حوکمو یەك سستەمو یەك جیهانیان کێشابێت بە زۆرو بە یەك سەرکردایەتییەوە. بەڵکو وەکو وتمان دانیانناوە بە بوونی ئاینی ترو زمان‌و نەتەوەکانیش, زۆر بەڕێزەوە مامەڵەیان لەگەڵدا کردوون, بێ هەڵخەڵەتاندنیان‌و بێ ئەوەی لە پشتەوە خەنجەریان لێبدرێت. لەبەر ئەوەیە لە جیهانی ئیسلامدا جولەکەو مەسیحی‌و صابئی‌و مەجوسی‌و هەموو موشریکەکانیش بە ئاسایش‌و بەدڵنیاییەوە ژیاون[1].

بەڵام ئەو میللەتانەی لە دەرەوەی جیهانی ئیسلام ژیاون, دەوڵەتی ئیسلامیی پەیماننامەی لە زۆربەی لایەنەکانی ژیاندا لەگەڵدا مۆرکردوون, دەکرێ بگەڕێیتەوە بۆ ئەوانەش لەو کتێبانەدا کە باس لە پەیوەندیە نێو دەوڵەتیەکان لە شەریعەتی ئیسلامدا دەکەن[2].

ڕێنمایی بنەڕەتیش لە دروستکردنی پەیوەندییە نێودەوڵەتیەکاندا لە ئیسلامدا بە پێی ئەم ئایەتەیە: (ياأيها الناس اِنا خلقناكم من ذكر واُنثى وجعلناكم شعوباً وقبائل لتعارفوا ان اكرمكم عند اللّه اتقاكم) الحجرات /١٣واتە: ئەی خەڵکینە ئێمە ئێوەمان لە نێرو مێیەك درووست کردووە، کردوومانن بە چەندەها نەتەوەو هۆزەوە بۆ ئەوەی یەکتر بناسن. لە ڕاستیشدا چاکترینتان لای خوا ئەوەتانە لەهەمووتان زیاتر لە خوا دەترسێت (فەرمانی خوا بەجێ دێنێ).

دەتوانین بڵێین جیهانێتی ئیسلامیی بەو مانایانەی خوارەوە جیا دەبێتەوە:

– دەست پێکردن لە بنەمای یەکتاپەرستییەوە, دانانی تەواو بەوەدا کە خەڵکی هەموو بەندەی خودای تاکو تەنهان, هیچیان لە هیچیان زیاتر نییە, بە لە خوا ترسان‌و کاری چاکەی زیاتر نەبێ, هەمووشیان برای مرۆڤایەتین پێیان خۆش بێت یان نا.

– جیهانێتی ئیسلامیی پێوەرێکی وردی هەیە بۆ ئەرك‌و ماف لە ڕوانگەی شەرعی ئیسلامەوە, دانی ناوە بەجیاوازیدا لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتییدا.

– جیهانێتی ئیسلامیی ئامانجی بنیاتنانی کۆمەڵگای مافدراوو دادگەرو بەهێزو ئازادە.

– لە بنەمای یەکسانی لە نێوان مرۆڤەکاندا بەبێ گوێدانە سامان‌و ڕەنگ‌و پلەو پایەو ڕەگەزو ئایین. جگە لە هەندێك شتی تایبەتی هەر ئایینێك لە ئایینەکان سەرچاوە دەگرێت.

بنەمای شورا(ڕاوێژ) کە لە بنەڕەتدا پێویستیی سیستمی سیاسییە, نەك تەنها لە کۆمەڵگای ئیسلامییدا, بەڵکو هاندەریشە بۆ ئەو بنەمایە لە کۆمەڵگای تریشدا, چونکە شەرعی ئیسلام دژی خۆبەسەراسەپاندن‌و چەوساندنەوەی مرۆڤەکانە لەلایەن هەندێکی تریانەوە

ئیسلام مرۆڤەکان پەروەردە دەکات لەسەر داهێنان‌و شارەزایی‌و لە دوو توێی بانگەوازەوە بۆ ئاوەدانی‌و پەرەپێدان، هەلیش دەڕەخسێنێ بۆ هەمووان کە وزەو توانای خۆیان بخەنەکار.

زانست فەرز دەکات لەسەر کۆمەڵگا, بۆ تەقاندنەوەی وزە مرۆییەکان, بۆ بەردەوام بوون لە گەشەکردن‌و پێشکەوتندا هەمیشە لایەنگری چەوساوان‌و ستەملێکراوانە, موسڵمان بن یان هەر ئاینێکی تر[3].

---

[1] ادم متز: الحضارة الإسلامية؛ توماس ارنولد: الدعوة الى الإسلام.

[2] الدكتور عبدالكريم زيدان : أحكام الذميين والمستأمنيين؛ المستشار علي علي منصور: الإسلام والعلاقات الدولية.

[3] الدكتور محمد امخزون : العولمة بين منظورين، مجلة البيان، عدد ١٤٥، ص١١٨.

بەڵام بەجیهانیکردن وەرگێڕاوی وشەی (globalization)ە, ئەمیش زاراوەیەکە واتە:جیهان بکرێت بە یەك جیهان, یەك ئاراستەبێت, لە چوارچێوەی یەك شارستانییەتدا بێت, لەبەرئەوە پێشی دەڵێن: گەردوونی یا هەسارەیی[1].

بیریاریی فەڕنسایی ڕۆجیە گاروودی دەڵێت: بەجیهانیبوون سیستمێکە بەهێزەکان تیایدا دەتوانن دیکتاتۆریەتی نامرۆیی بسەپێنن، کە ماوە دەدات بە چەوساندنەوەی هەژارە بێ دەسەڵاتەکان بە بیانووی ئاڵوێری ئازاد و بازاڕی ئازاد[2].

هانس پیتەر مارتین‌و هاروڵد شۆمان نووسەرانی کتێبی (فخ العولمة) دەیسەلمێنن کە: بەجیهانیکردن بریتیە لە گەیاندنی مرۆڤایەتی بە یەکجۆر لە گۆڕانکارییو, خواردن‌و جلوبەرگ‌و خووونەریت[3].

جیمس ڕوسناو, یەکێ لە زانایانی سیاسەتی ئەمریکا, دەڵێت: ئەوە پەیوەندییە لە نێوان ئاستی جیاجیای شیتەڵکردنی ئابووری‌و سیاسەت‌و ڕۆشنبیریی‌و ئایدۆلۆژیا, هەروەها دووبارە بەرهەمهێنان‌و هاتنەناوەوەی پیشەسازیی لە ڕێگای سنورەوەو بڵاوبونەوەی بازاڕی (تمویل)ی شمەکی بەکاربردنی دەوڵەتی جیاجیا لە ئەنجامی ناکۆکیی لەنێوان کۆمەڵانی کۆچکردوو, کۆمەڵانی دانیشتوودا[4].

نوسەرێکی فەڕەنسایی لە بارەی سیستمی سەرمایەداریی بەجیهانیکراوەوە دەڵێت: چەندە سیستمی سەرمایەداریی چاوچنۆك لە ڕێگای بەجیهانیکردنەوە بڵاوبێتەوە, ئەوەندە ڕاپەڕین‌و جەنگی ڕەگەزیی‌و خێڵەکی‌و دەمارگیریی‌و ئایینی بۆ گەڕان بەدوای پێناسی نەتەوەیی لە داهاتوودا دروست دەبێت، هەروەها چەند زانیارگەریی(المعلوماتية)و دامودەزگای تەلەفیزیۆن‌و بێتەل‌و تەلدار بڵاوبێتەوە، ئەوەندە کوت‌و پێوەندی بەندایەتی دەکرێتە دەست‌و مل، دیاردەی تاکێتی‌و گۆشەگیریی‌و ترس‌ولەرزی بێ خێزانی‌و بێتایەفەیی‌و بێ نیشتمانیی بڵاودەبێتەوە. هەروەها چەند تێکڕای ژیان زیادببێت ئەوەندەش کەرەسەی کوشتن زیاد دەبێت, هەروەها چەند کەرەسەی خۆشگوزەرانی زیاد بکات ئەوەندە تاوان‌و بەربەریەت‌و کۆیلەیێتی زیاد دەکات)[5].

جان نیدرفین بیترس دەڵێت: بڵاوترین تەفسیری بەجیهانیکردن ئەو بیرۆکەیە کە دەڵێت جیهان دەڕوات بەرەو یەککگرتن‌و یەکگرتنی پێوەرەکان لە دووتوێی هاوکاتی تەکنەلۆژیاو بازرگانێتی‌و ڕۆشنبیریی هەڵقوڵاوی ڕۆژئاوا. لە سەری دەڕوات‌و دەڵێت: بەجیهانیکردن لەسەر قسەی ئەلیرو ئاماژە بۆ ئەو پرۆسانە دەکات کە گەلانی جیهان لە یەك کۆمەڵگای جیهانیدا پێکەوە دەلکێنێ[6]. بە بڕوای ئەو نووسەرە بەجیهانیکردن لە ئەورووپاو ڕۆژئاواوە دەست پێدەکات, لە ناوەڕۆکیشدا بیردۆزێکی بەڕۆژئاواییکردنە لە ژێر ناوێکی تردا, کە هەموو کێشەکان دەبەستێتەوە بە چەقی ئەورووپاوە, ئەویش دەلاقەیەکی بچوکە لەسەر جیهان, لە هەردوو لایەنی مێژوویی‌و ڕۆشنبیریەوە لەبەرئەوە پێویستە ناوی بە ڕۆژئاواییکردنی لێبنرێت نەك بەجیهانیکردن[7].

ئەگەر بگەڕێینەوە سەر توێژینەوەی بیریاران‌و توێژەرانی عەرەب لەسەر بەجیهانیکردن, دەبینین ئەوان هەموویان بەجیهانیکردن لە چوارچێوەی ئەم قسانەی خوارەوەدا دەناسن, کەهەمووی بەیەك ڕاستی ڕوون دەکەنەوەو ئەنجامەکانیشان نزیکە.

دکتۆر حەسەن حەنەفی دەڵێت: بەجیهانیکردن لە بەرژەوەندی ئەوانی ترە, لەسەر حسابی من، هەروەها هیوای ئەوانی تر بەرامبەر بە لاوازی منە. هەروەها دەڵێت: ئەو شارستانییەتی ناوەندەو خەڵکی تر پاشکۆیە. ئەو

[1] یاسر عبد جواد: مقاربتان عربيتان للعولمة، مجلة المستقبل العربي، عدد ٢ شباط ٢٠٠٠م.

[2] روجية غارودي: العولمة المزعومة، الواقع البدائل، تعريب: الدكتور محمد السبيطي، دار الشوكاني للنشر والتوزيع، صنعاء ١٩٩٨، ص١٧.

[3] هانس بيتر مارتين وهارولد شومان: فخ العولمة، ترجمة: الدكتور عدنان عباس علي، مراجعة وتقديم: الاستاذ الدكتور رمزي زكي.

[4] نعيمة شومان: العولمة بين النظم التكنلوجية الحديثة، موسة الرسالة، بيروت ١٩٩٨، ص١٤٠.

[5] الدكتور محمد جلال العظم والدكتور حسن حنفي: ما العولمة، مركز دراسات الاستراتيجية، ص٢٠.

[6] مايك فيدرسون واخرون: محدثات العولمة، ترجمة: عبدالوهاب علوب، طبعة الاولى، القاهرة، ص٦٠.

[7] نفس المصدر، ص٦٢.

ناوەندێتییەش شاراوەیە لە هۆشی ئەوروپادا, لە سەر بنەمایەکی ڕەگەزپەرستیو ویستی دەست بەسەردا گرتنو زاڵبوون پێشکەش دەکرێت[1].

دکتۆر سیار ئەلجومەییل دەڵێت: ئەوە پرۆسەی چوونە ناو مرۆڤو بیروهۆش و پێکهاتەی مرۆڤو کۆمەڵگاکانو دەوڵەتانو قەوارەیانو جوگرافیاو بوارەکانی ئابووریو بزاوتەکانی ڕۆشنبیرییو ڕاگەیاندنەکانو مەوداکانیەتی[2].

بەلام دکتۆر مستەفا مەحمود دەڵێت: بەجیهانیکردن زاراوەیەکە بۆ ئەوە دەستبپێکرد کە نیشتمان خاڵی بکاتەوە لە نیشتمانپەروەریو نەتەوایەتیو لایەنگریی ئایینیو کۆمەڵایەتیو سیاسیی, بە شێوەیەك مرۆڤ هیچی بۆ نەمێنێتەوە, جگە لە خزمەتکاریی بۆ زلهێزەکان[3].

دکتور نەجیب غەزاوی, ئیمپراتۆریەتی بەجیهانیکردن دەچوێنێ بەو ئیمپۆراتۆریەتانەی کە لەم سەردەمەی دوایدا باوبوونو دەڵێت: دەیەوێ یەك سیستمی حوکمو شێوە ژیانی سیاسییو کۆمەڵایەتییو ڕۆشنبیریی بە زۆر بسەپێنێ. هەروەك ڕەوشتی ئیمپراتۆریەتە نوێکانی بەریتانیا و فەرەنسا لە کۆلۆنیالیەکانیاندا, هەروەها بەجیهانیکردنی کۆمۆنیستی کە یەکێتیی سۆڤیەت نوێنەرایەتی بەجیهانیکردنەکەی دەکرد[4].

بەجیهانیکردن لەلای دکتور موحەممەد عابد ئەلجابری ئامانجی سێ قەوارەیە, دەوڵەتو میللەتو نیشتمان, ناویشی دەنێت ڕۆشنبیریی دەستتێوەردان, دەستتێوەردانی پیرۆزیەکانی میللەتانو گەلان لە ڕووی زمانو دەوڵەتو نیشتمانو ئایینەوە[5].

هەروەها ئابووریناس دکتۆر نەعیمە شۆمان دەڵێت: لە سایەی بەجیهانیکردندا, وڵاتانی جیهان نەك هەر سەربەخۆیی خۆیان لە دەستتدەدەن, بەڵکو دەچن بەرەو کۆیلەیی, وڵاتەکان قەرزارن, هەمووشیان وەستاون لە دانەوەی قەرز, هیچیشیان بەدەست نییە لە بارەی ئەو پرۆژانەی دەسەپێنرێت بەسەریاندا[6].

بە بڕوای دکتۆر عەبدولعەزیز تووەیجیری، بەجیهانیکردن بەو چەمکەیەوە, بە تەواوی پێچەوانەی یاسا نێودەوڵەتییەکانە, هەروەها ناگونجێت لەگەڵ سروشتی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا, چونکە پشت بە شێوازێکی نوێ دەبەستێت لە شێوازەکانی ڕووبەڕووبوونەوەی شارستانییەتدا, کە ڕۆژئاوا سەرقاڵیەتی, بەو چەمکە گشتیەی ڕۆژئاوا دژی پێناسەی گەلانو ڕۆشنبیری میللەتانەو, لەپێناو سەپاندنی یەك ڕۆشنبیریو ملکەچکردنی هەموو جیهان بۆ یەك دەسەڵاتی شارستانیی کاردەکات[7].

بەشدارانی سمیناری ئابووری, کۆکن لەسەر ئەوەی کە لافاوی بەجیهانیکردن لە مەبەستەکانی تێپەڕیو مەترسی گەورەی هەیە لەسەر سیستمە ئابورییەکانی جیهان[8].

لە کۆتایشدا موحەممەد نوهەیم یوسف پێناسەی بەجیهانیکردن بەم شێوەیە دەکات: مەبەستێکی تاکییە بۆ تێگەیشتنێك کە پشت دەبەستێت بە مەرجیعیەتێك تایبەتە بە شارستانیەتێکی دیاریکراو, بەو ئیعتیبارەی کە چەمکی باڵای مافەکانی مرۆڤەو پێویستە دنیابگرێتەوە[9].

دواین کەسیش کامیل ئەبوسەقەد دەیەوێت, هەموو پێناسەکان لەیەك پێناسەدا کۆبکاتەوەو ڕاستیی بەجیهانیکردن

---

[1] الدكتور محمد جلال العظم والدكتور حسن حنفي: المصدر السابق، ص٢٠ .

[2] سيار الجميل: العولمة والمستقبل استراتيجية التفكير، دار الأهلية للنشر والتوزيع، عمان، ص٣٢ .

[3] أحمد مصطفى عمر: اعلام العولمة وتأثيره في المستهلك، مجلة المستقبل العربي، ص٧٢، نقلا عن مجلة الإسلام وطن، عدد ١٣٨، حزيران ١٩٩٨، ص١٢ .

[4] الدكتور نجيب عزاوي: العولمة الخطر على الهوية والكيان، مجلة المعرفة، عدد ٤٣٢ ، تشرين اول ١٩٩٩.

[5] الدكتور محمد عابد الجابري: قضايا في الفكر العربي المعاصر، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت ١٩٩٧، ص١٤٧ .

[6] نعيمة شومان: المصدر السابق، ص٢٠ .

[7] الهوية والعولمة من منظور حق تنوع الثقافي، مجلة السلم اليوم، عدد ١٥، ص٤٠ .

[8] الدكتور يوسف كمال وعبدالرحمان يسرى والدكتور عبدالحميد الغزالي والدكتور رفعت العوضي: وهم، مجلة البيان، يونيو ٢٠٠٠، ص٦٠ .

[9] محمد فهيم يوسف: حقوق الانسان في ضوء التجليات السياسية للعولمة، مجلة البيان، عدد ١٣٢، ديسمبر ١٩٩٩.

دیاریی بکاتو دەڵێت: ئەگەر بڵێی رووپۆشی سەرمایەداریی لەوانەیە وابێت, ئەگەر بڵێی ناکۆکییو ململانێیە لەسەر بازاڕەکان ئەمەش ڕاستە, ئەگەر بشڵێی خستنە بازاڕێکی جیهانیی بەرهەمەکانو شمەکەکانو بیرەکانو نموونەکانە ئەوەش ڕاستە, ئەگەر بڵێی ئەوە کێشەی یەکجۆرکردنی جیهانە بە جۆرو شێوازی رۆژئاوایی ئەوەش هەر ڕاستە, ئەگەر بڵێی بریتییە لە دروستکردنی بازاڕێکی جیهانی یا گەردوونیی, یا گوندێکی بچوك ئەوەش هەر ڕاستە، ئەگەر وترا بریتییە لە بازاڕێکی گەردوونی جیهانیی کە کاردەکات بۆ هەڵلوشینی خەڵكو شتەکانیش, بۆ ئەوەی بیهێنێتەوە دەرەوە وەکو شمەك ڕاستە، ئەگەر بڵێی بەجیهانیکردن دەستدرێژی دەکاتە سەر سەروەریی دەوڵەتەکان ئەوەش ڕاستە, ئەگەر بشڵێی بەجیهانیکردن هەناردەکردنی لایەنە خراپەکانی ڕۆشنبیریی و پاشەڕۆی شارستانیەتی رۆژئاوایە ئەوەش ڕاستە [1].

ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت لەو پێناسەو ڕاو بۆچوونانە لەبارەی بەجیهانیکردنەوە, نووسەرانی عەرەب بە جیاوازی ئاڕاستەو دیدیانەوە, کۆکن لەسەر مەترسیی بەجیهانیکردن و کاریگەریی زۆری لە شێواندنی ڕاستیەکانو پشێتکردنیانو ڕازاندنەوەی خراپو پڕوپوچ, ئەمەش دیاردەیەکی ڕاستە, ئەوە دەگەیەنێت کە موسڵمانان _ لەگەڵ بوونی جیاوازیی لە ڕاو بۆچونیاندا _ هەموویان دەرکی ئەو مەترسیەیان کردووەو پەرۆشن بۆ بەرژەوەندیە باڵاکانی ئوممەت. منیش بیروڕای زۆر بیریارو توێژەرانی رۆژئاواو عەرەبم هێناوە, ئەوانەی لێکۆڵینەوەی زانستیو گشتگیریان کردووە لەسەر بەجیهانیکردن, بۆ ئەوەی بە خوێنەر بڵێم: کێشەی بەجیهانیکردن کێشەیەکی تاکەکەسیی نەیار نییە, بەڵکو بریتییە لە کۆکبونێکی زانستیانەی بەویژدانی ڕاو بۆچوونەکان لەسەر بەجیهانیکردنو ئامانجەکانیو دەرکەوتنیو ڕوونی ئامانجەکانی کە خەریکە هەموو گۆی زەوی دەگرێتەوە, بێ ئەوەی بچوکترین گومان هەبێت لەو گوتانەی بڕیاریانداوە لەسەر ڕاستیی بەجیهانیکردن و ئاسۆ جیاجیاکانیو سروشتی دەسەڵاتە چەوسێنەرەکەی. بەڵگەش لەسەر ئەوە ئەو ئەنجامە پڕمەترسیانەیە کە خەریکە لە هەموو دنیادا دەردەکەوێت, ئەوەش توێژەران هەموو لەسەری کۆکن بریتییە لە:

**یەکەم:**

وتووێژی باکوورو باشوور مرد, چونکە دەمامکی کۆمەکە درۆینەکانی دەوڵەتە دەوڵەمەندەکان بۆ دەوڵەتە هەژارەکان دڕا, هەروەکو ناکۆکیی رۆژهەڵاتو رۆژئاواش لە قازانجی رۆژئاوادا مرد، هەروەها بیرۆکەی گەشەکردنی ئابووری گیانی دابەدەستەوە, ئیتر زمانی هاوبەش نەما, بەڵکو یەك زمانی سەپێنراو بوو, فەرهەنگێکی هاوبەش نەبوو بۆ ناونانی گرفتەکان, چونکە زاراوەگەلی وەکو باکوورو باشوورو جیهانی سێو ڕزگاریو هیتریش هیچ مانایەکیان نەما [2].

**دووەم:**

لە ڕوانگەی تیۆرسینانی (منظر) بەجیهانیکردنەوە, ئەو کۆمەڵگایانەی لاوازن لە بەرهەمهێنانی خۆراکیان, یان کڕینی داهاتی هەناردە پیشەسازیەکانیان, وەك نموونە شیاوی مانەوە نین, بەڵکو بارن بەسەر مرۆڤایەتیەوە, یا بەسەر ئابووری جیهانیەوە, لەوانەیە یاسای مانەوە بۆ چاکترینە, ببێتە کۆسب لەڕێگای پەرەپێدانیاندا, لەبەرئەوە دەبێ لەحسابدا نەمێنێ. ئیتر پێویست ناکات. جەنگە ناوخۆییەکانیان بوەستێنرێت یا کۆمەك بکرێت یا فریای بکەویت [3].

**سێیەم :**

سەر لەنوێ ئیمپریالیزمی ئابووریو سیاسیو ڕۆشنبیریو کۆمەڵایەتی گەڕاوەتەوە لە شێوەی بەجیهانیکردندا بەناوی ئابووری ئازادو ڕێکەوتننامەی (گات) واتە: بازرگانی ئازادو ململانێو قازانجو جیهان یەك گوندەو, پاشکۆیەتی سیاسیو تێپەڕاندنی دەوڵەتی نەتەوەییو بڵاوکردنەوەی بەهاکانی بەکاربردن لە جنسو هێز بەکارهێنانو جورعەی

---

[1] العولمة التجارية والادارية والقانونية، منشورات دار الوسام، طبعة الاولى، بيروت ٢٠٠٠، ص٥١.

[2] هاتس بيتر نارتين وهارولد شومان: المصدر السابق، ص٦١.

[3] الدكتور زكي حنوش: الصناعة العربية في مواجهة العولمة، ص١٣.

ڕێکخراو[1].

**چوارەم :**

ئێستا جیهان کە ملکەچی بە جیهانیکردنە، بێ دەوڵەتە، بێ نەتەوەیە, بێ نیشتمانە, چونکە گۆڕاوە بۆ جیهانی چەك (صكوك)و دامەزراوەکان‌و جیهانی سەرمایەدارە چالاکە کاریگەرە بەڕیوەبەریەکان‌و جیهانێکی‌تر کە بریتین لە ستەملێکراوە بەکاربەرەکانی خواردەمەنی‌و لەقوتوکراوەکان‌و خواردنەوەکان‌و ئەو زانیاریانەی لە ڕێگای سەدان کەناڵی ئاسمانیەوە دەسەپێنرێت بەسەریاندا، بەشێوەیەك جیهانەکەیان ئەوەیە کە تۆڕە ترسناکەکانی پەیوەندیکردن دروستی دەکات[2].

لەگەڵ لێکۆڵینەوەی نووسەری (فخ العولمة) کە ناومان بردووە گەیشتوینە ئەوەی بەجیهانیکردن ئەمە ئەنجامەکانیەتی:

١. زۆربوونی بێکاران.
٢. نزمبوونی کرێ.
٣. دابەزینی ئاستی بژێوی.
٤. کەمبوونی خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکان کە دەوڵەت پێشکەشی دەکات.
٥. ئازادکردنی ئالیەتی بازاڕ.
٦. دوورکەوتنەوەی دەوڵەت لەچالاکییە ئابوورییەکان‌و هێشتنەوەی ڕۆڵی دەوڵەت تەنها لە بواری پاراستنی ڕژێم, کە ژیانی سەقامگیر بۆ حکومەتەکان دابین دەکات.
٧. خراپترابوونی جیاوازیی لە دابەشکردنی ساماندا لە نێوان هاووڵاتیاندا.

بە خوێندنەوەیەکی ئاماریی (بول بیروخ) پرۆفیسۆری بەناوبانگی مێژووی بەلجیکا, لە توێژینەوەکەیدا بەناونیشانی (المبادئ الاقتصادية المؤسسة للعولمة من منظور تأريخي) دەگاتە ئەو ئەنجامانە[3].

سەرۆك وەزیرانی مالیزیا مەهاتیر موحەممەد, کە وڵاتەکەی لەم ساڵانەی دواییدا بە کاریگەریی بەجیهانیکردنەوە دەتلایەوە دەڵێت: جیهانی بەجیهانیکراو, لەوە زیاتر دادگەرو یەکسان نابێت، بەڵکو ملکەچی دەوڵەتە بەهێزە دەسەڵاتدارەکان دەبێت, هەروەکو داڕوخانی جەنگی سارد بوو بە هۆی مردن‌و کاولکردنی زۆر لە خەڵکی، بەجیهانیکردنیش لەوانەیە هەمان شت بکات, بەڵکو لەوانەیە زیاتریش بکات لە جیهانی بەجیهانیکراودا, وایلێدێت کە دەوڵەتانی دەوڵەمەندی دەسەڵاتدار دەتوانن ویستی خۆیان بسەپێنن بەسەر ئەوانی تردا, ئەوانەی کە حاڵیان باشتر نییە لەوەی کەجاران تیابوون, لەکاتێکدا داگیرکراوبوون لەلایەن ئەو دەوڵەمەندانەوە[4].

لەوانەیە خوێنەری بەڕێز لە ئاستی زانستی بوون‌و بابەتی بوونی ئەوانە بپرسێت کە لەسەر بەجیهانیکردنیان نووسیووە، جا عەرەب بن یا ئەوروپایی؟ وەڵامی ئەو پرسیارەمان دکتۆر نەجیب غەزاوی دەیداتەوەو دەڵێی: بیروڕای بانگخوازانی بەجیهانیکردن, زۆر ڕاپۆرتی بوون‌و بەهەموانکردن‌و پەلەی تێدایە, لەگەڵ گەڕان بەدوای گیانی زانستیبووندا، بەڵام بیروڕای دوژمنانی بەجیهانیکردن بە زۆری مۆرکی جیهانێتی بابەتیبوونی پێوەدیارە, ئەوەی نیشانەو دیاردەکانی بەجیهانیکردن دەخوێنێتەوەو لێیورد دەبێتەوەو لەهەموو بوارە جیا جیاکانی ژیاندا لە بەرچاویان دەگرێو شیتەڵیان دەکات بۆ ئەو مەترسیانەی کە هەیەتی بۆ سەر پێناس‌و قەوارەو چەك‌و ئاسایشی جیهانی[5].

بانگخوازانی بەجیهانیکردن –بۆ نموونە دەڵێن– بەجیهانیکردن ئاڵوگۆڕی سوودەکان‌و شارەزاییەکان‌و زانیاریەکانە

---

1 الدكتور محمد جلال العظم والدكتور حسن حنفي: المصدر السابق، ص١٧.

2 الدكتور محمد عابد الجابري: المصدر السابق، ص١٤٨.

3 حسين بيومي، مجلة الثقافة العلمية، عدد ١٠٤، يناير ٢٠٠١، ص٥٣.

4 محاضرة في كوالالامبور في ٢٤ يوليو ١٩٩٦، نقلا عن الدكتور احمد بن عثمان التويجري: الدين والعولمة، مجلة اسلام اليوم، عدد ١٦-١٧، ص١٩.

5 الدكتور نجيب عزاوي: المصدر السابق، ص٤٦.

لە نێوان میللەتانو گەلاندا, دیاردەیەکیشارستانییەو دەبێتە هۆی گۆڕینی جیهان بۆ گوندێکی گەورە، کە هەمان کاریگەریی ئابووریو کۆمەلأیەتیو رامیاریو راگەیاندن دەگرێتەوە، ئەمەش بۆ خۆی دەبێتە هۆی تێهەڵکێش بوونێکی خێرای ئابووری جیهان. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ڕێگەی سندوقی دراوی نێودەولەتیەوەو دامەزراوگەلی ترەوە کە خۆی زاڵە بەسەریاندا دەیەوێت بەجیهانیکردن بەپێی ئەو چەمکە لە خەڵك بگەیەنێت[1].

ئەو داڕشتنانە, خۆیان بەجیهانیکردن تۆمەتبار دەکەن, چونکە دان بەوەدا دەنێن کە ئەمریکا لەگەڵ ئەو سەرمایەدارە چاوچنۆکانەدا کە داموودەزگای بەجیهانیکردنیان بەدەستە دەیانەوێت جیهان ملکەچی ئەو بارودۆخە بکەن کە دەیانەوێت.

بۆ کەسێك هەیە لەڕوانگەی ئەوەی خوێندویەتیەوەو دەیخوێنێتەوە بپرسێت, ئالۆگۆڕی ئەو سودو شارەزاییانە لە بەرژەوەندیی کێیە؟ کێ ڕێبەرایەتی ئەو تاکە گوندە جیهانییە دەکات؟ کێ پلان دادەنێت بۆ ئاڕاستەکردنی ئەو گوندە بەیەك ئاڕاستە؟ کێ سوود وەردەگرێت لەو تێهەڵکێش بوونە خێرایەی ئابووری جیهانیی؟ واقیعی ئەمڕۆی مرۆڤایەتیی کە توێژینەوەکان دەیسەلمێننو تەزای هاوکارییی مرۆڤایەتیی بەدرۆ دەخەنەوە کە ئەوان دەیڵێن..

## ریشەکانی بەجیهانیکردن

توێژەران دەپرسن: ئایا بەجیهانیکردن رۆڵەی ئەم سەردەمەی دواییە، یا ریشەی کۆنی هەیە لە مێژووی ئەوروپای کۆندا؟

هەندێکیان وای بۆدەچن کە بەجیهانیکردن دیاردەیەکی نوێ نییە، بەڵکو سەرەتاکانی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی نۆزدەهەم، لەگەڵ دەستپێکردنی هەڵمەتی ئیمپریالیزمی رۆژئاوا بۆ داگیرکردنی ئاسیاو ئەفریقاو هەردوو ئەمریکا سەریهەڵداوە، پاشان نزیك بوویەوە لە گەشەکردنی سیستەمی بازرگانیی نوێ لە ئەوروپا, ئەوەی کە بوو بە هۆی لە دایکبوونی سیستمێکی جیهانیی ئالۆز کە بە جیهانیی ناسراو پاشان بوو بە بەجیهانیکردن[2].

بەلأم هەندێکی تر وای بۆ دەچن کە زاراوەی سیستەمی جیهانیی لە کۆنگرەی ڤییەنای ساڵی ١٨١٥ ی زایینیەوە بەکاردەهێنرێت، ئەوەی کە (مەتەرنیخ) سەرۆك وەزیرانی نەمسا رێبەرایەتی کرد، دوای ئەویش (بسمارك)ی ئەڵمانی لە حەفتاکانی سەدەی حەڤدەهەم, پاشان لە سەر دەستی (کلیمانسۆ)ی فەرەنسایی لە کۆنگرەی ڤەرسای ساڵی ١٩١٩ نوێ بوویەوە، هەروەها دواتر لەسەر دەستی هاوپەیمانان لە (یاڵتە) لە دوای جەنگی دووەمی جیهانی جارێکی تر نوێکرایەوە[3].

نووسەری کتێبی (مسائل العولمة) دەڵێت: مێژووی بە نێودەوڵەتی کردنی پرۆژە سەرمایەدارییەکان، مێژوویەکی دوورو درێژە نەخزێنراوەتە ماوەی دوای ساڵی ١٩٦٠ەوە[4].

لەراستیدا ئەو توێژەرەی لێکۆلینەوەی مێژوو دەکات لە کۆنترین سەردەمەوە تا ئەمڕۆ، کە چەندین ئیمپراتۆریەتی تێدا دروست بووە، ئەوە رەچاو دەکات کە هێزێکی گەورە، هەمیشەویستوویەتی بە تەنیا دەست بگرێت بەسەر جیهانداو ملکەچی بکات بۆ بیروڕاکانی. یۆنانی و رۆم و فارسەکانو تەتەرو ئیمپراتۆریەتە نوێکان، بۆ سام نواندنو دەست بەسەراگرتن هەموویان هەمان ئاراستەیان هەبووە. ئەوروپای نوێش لەهەوڵیدا بۆ دەست بەسەراگرتنو داگیرکردنی ستەمکارانەی پشکی شێری بۆخۆی بردووە, چونکە شارستانیەتی نوێ خۆی بە شارستانیەتێکی جیهانیی ناوەندیی دەزانێت، کە لە بیرو‌راو بەرهەمەکانیدا جیهانیەو ناوەندییشە، چونکە لە بەها پرشو بلأوەکانیدا بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە.

---

[1] الدكتور رسلان خضور واالدكتور سمير ابراهيم: مستقبل العولمة، ص١٠-١١.

[2] أحمد مصطفى عمر: المصدر السابق، ص١٧.

[3] مايك فيدرسون واخرون: المصدر السابق، ص٤٨.

[4] يحيى ابيحياوي: العولمة، ص٢٤-٣٠.

لەبەرئەوە، ئەوە شارستانیەتێکە داننانێت بە هیچ شارستانیەتێکی تردا لە شارستانیەتەکانی ئەمڕۆ. بەڵکو کاردەگاتە ئەوەی سەرکردەو ئاراستەکەرانو مونەزیرانی ئەم شارستانیەتە ئەوە رەتدەکەنەوە کە لە پێش ئەم شارستانیەتەدا هیچ رووداوێکی گرنگ لەم جیهانەدا روویدابێت.

بیریاری جەزائیری مالك بن نەبی دەڵێت: ئەو وتەزایانەیە رۆشنبیریی ئیمپراتۆریەتی رۆژئاوای دروست کردووە، کە لەسەر بنەمای سەروەرییەکی رەگەزپەرستانەو داگیرکەرانە دروست بووە[1].

منیش وایدەبینم کە دەسەڵاتی بەجیهانیکردن بەسەر جیهانی ئەمڕۆدا بەو سیفاتە گشتگیرانەیەوە، لە ئەنجامی گەشەکردنی بارودۆخی رامیاریو ئابووری زانستیەوەیە لەگەڵ سروشتی شتەکاندا دەڕواتو لە مێژووی رۆژئاوای نوێدا دوا قۆناغی هەوڵدانی رۆژئاوایە بۆ دەستگرتن بەسەر جیهانداو سڕینەوەی ئەویتر. بەڵام ئەمجارەیان لەسەر شێوازە ئەوروپاییە کۆنەکە نییە، بەڵکو لەسەر شێوەیەکی ئەمریکایی سەرمایەداریی جولەکانەی توندڕەوی چاوچنۆکە.

توێژەرێکی تر نارازیە لەو قسەیەو وای بۆدەچێت کە بەجیهانیکردن لە ئەنجامی گەشەکردنی ئیمپریالیزمی ئەوروپاوە نەهاتووە, یا دیاردەیەکی شۆڕشی پیشەسازی نییە، بەڵکو سیستمێکی گەردوونیی گشتگیری نوێیە، سیفاتەکانی لە سیفاتی ئیمپراتۆریەتە کۆنەکان ناچێت[2].

هەندێ توێژەری تریش هەن، سەرەتاکانی بەجیهانیکردنی ئێستا دەگێڕنەوە بۆ ئەو سیاسەتانەی کە ئەمریکا دەیەوێت لە رێگایەوە دەست بگرێت بەسەر جیهاندا، بەڵام جەنگی سارد لە نێوان ئەوو یەکێتی سۆڤێتیدا ئەو دەسەڵاتەی دواخست بۆ ساڵی ١٩٨٩ لە کاتێکا یەکێتی سۆڤێت لاواز بوولە ئەنجامدا پێرسترۆیکای تێدا دەرکەوت، کە ئالاکەی گۆرباتشۆف هەڵی گرتبوو.

نووسەرانی (فخ العولمة) سەرەتای راستەقینەی نەخشەسازیی بەجیهانیکردن دەگێڕنەوە بۆ ساڵی ١٩٩٥, کە سەرۆکی سۆڤێتی پێشوو گۆرباتشۆف، بانگەوازێکی ئاراستەی پێنج سەد سەرکردەی جیهانیی بواری سیاسەتو داراییو ئابووری کرد بە مەبەستی بنیاتنانی مەشخەڵی رێگا بۆ سەدەی بیستو یەکەم لە ئوتێلی (فیرمۆنت)ی بەناوبانگ لە سانفرانسیسکۆ لە ویلایەتە یەکگرتووەکان کۆببنەوە, لەو کۆنگرە داخراوەدا سەرۆکانی بەجیهانیکردن، لە جیهانی کۆمپیوتەرو داراییو ئابووری سەرمایەداریی گەورەو پرۆفیسۆرانی ئابووری لە زانکۆکانی ستانفۆردو هارڤاردو ئۆکسفۆرد بەشداربوون، لە سیاسیەکانیش سەرۆکی پێشووی ئەمریکا جۆرج بۆشو وەزیری دەرەوەی پێشو مارگرێت تاتشەرو سەرۆك وەزیرانی هەرێمی سەکسۆنیاو هی تریش بەشداریان تێداکرد[3].

پرۆژەی سیاسیی سیستمی نوێی جیهان، کە بە بەجیهانیکردن کۆتایی هات, بریتیە لە پارچەپارچە کردنی پێکهاتە سیاسیەکان, بۆ کانتۆنات ودەوڵەتۆکەی بچوك بچوکی لاوازو ئالودە بە کێشەو برسێتیو ناکۆکیو بەزم[4].

## سەرکردایەتی بەجیهانیکردن

لەوانەیە توێژەران لە زۆربەی جیهاندا، لەگەڵ جیاوازی رەوتی سیاسییو فکریاندا کۆبن لەسەر ئەوەی کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەرکردایەتیی بەجیهانیکردنی نوێدەکات لە جیهاندا، بە تایبەتی دوای روخانی یەکێتی سۆڤێتو بلۆکی دووەم, ئیتر ئەمریکا لەرووی هێزو سەپاندنی سەروەریو دەسەڵاتیدا بە تەنیا مایەوە.

دکتۆر ئیدوارد سەعید دەڵێت: ئێمە دەبینین جەمسەرێتی رۆژئاوایی ئەمریکا لەدوای روخانی یەکێتی سۆڤێت رۆژ لە دوای رۆژ چڕ دەبێتەوەو پرۆسەی پارچە پارچە بوون و کوشتنو بڕینو قەڵاچۆکردنی بە کۆمەڵ رووی کردۆتە جیهانی سێو جیهانی دووی رابردوو, لەکاتێکا یەکگرتنی جیهان بەرەو پتەوی دەڕوات, بۆ ئەوەی دەسەڵاتی رەها بەسەر جیهاندا بەدەست بێنێ.

---

[1] مالك بن نبي : وجهة العالم الإسلامي، ص٢٧ – ٢٨ .

[2] سيار الجميل: المصدر السابق، ص٣٤ .

[3] هاتس بيتر مارتين وهارولد شومان: المصدر السابق، ص٢٢ – ٢٣ .

[4] سيار الجميل: العولمة الجديدة والمجال الحيوي للشرق الاوسط مفاهيم عصر القادم، بيروت ١٩٩٧، ص٥٧ .

راستیی مێژوییش دەڵێت: ئەمریکییەکان هەر لە سەرەتای دەوڵەتەکەیانەوە،خۆیان ئامادە دەکەن بۆ ئەو رۆڵە، هەروەکو باوەڕیان بە بیردۆزی (قەدەری دەرکەوتووی ئەو کاتە) هەبووبێ.

یەکەم سەرۆکی ئەمریکا جۆرج واشنتۆن لە وتارە سەرۆکایەتیەکەیدا لە ساڵی ١٧٨٩دەڵێت: خوا کارێکی گرنگی خستۆتە ئەستۆی گەلی ئەمریکا[1].

هەروەها سەرۆکێکی تری ئەمریکا (تۆماس جیفرسۆن) لە وتاری سەرۆکایەتیدا، ناوی ئەو ئەرکە گرنگە دەبات بە (گەلی هەڵبژاردەی خوا ). سەرۆك ئایزنهاوەریش لەوتارێکی رامیاریدا لە ساڵی ١٩٥٢ دەڵێت: بۆ روبەروبوونەوەی بەربەرەکانیەکانی ئەم سەردەمەمان قەدەر بەرپرسیارێتی سەرکردایەتی جیهانی ئازادیی داوە بە کۆڵ وڵاتەکەی ئێمەدا، پێش ئەویش کاتێ جەنگی دووەمی جیهانیی کۆتایی هات، سەرۆکی ئەمریکا (رۆزفێڵت) وتی: ئێستا پێویستە دنیا بکەین بە ئەمریکایی[2].

ئەو داواکاریانەیان بە بەڵگەی ئایینیو زانستی لەلایەن سیاسییەکانی ئەمریکاوە لەم دواییەدا دووبارە کردەوە، وەکو رۆماننوسی ئەمریکایی هێرمان ملفیل (١٨١٩-١٨٩١)، ئەلفێرد بیفریدج ئەندامی ئەنجومەنی پیرانی ئەمریکاو قازی ئەمریکاش ئۆلیفەر وندل (١٨٤١-١٩٣٥)[3].

نووسەری ئەمریکا نعۆم چۆمسکی دەڵێت: گریمانەی شاراوە ئەوەیە رژێمی ئەمریکای تایبەت بە رێکخستنی کۆمەڵایەتیو دەسەڵاتو بیروباوەڕ کە هاوڕێیەتی پێویستە گشتی بێت، هەرشتێکی لەوە کەمتر قبوڵ ناکرێت، هەرگیز نەرمیشی لەگەڵدا نانوێنرێت. هەموو کارو رەوشتێك کە ئێستاویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دەیگرێتەبەر بۆ بڵاوکردنەوەی رژێمو بیروباوەری کارێکی بەرگری لەخۆکردنە[4].

جۆشیا میرڤیك یەکێ لە دیارترین توێژەرانی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکایەو دەڵێت: ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە توانایدا هەیە رۆڵێکی گرنگ ببینێ لە بڵاوکردنەوەی چەمکی رۆژئاوایی مافەکانی مرۆڤ, لە رێگای دبلۆماسیەتێکی هێمنانەو کۆمەکەکانیەوەو لە رێگای کاری سەربازیش ئەگەر پێویستی کرد[5]. بە هەمان شێوە فردریك جیمۆن دەیەوێت ئەو راستیە لە توێژینەوەکەیدا دەربخات[6]. کە پلانێکی تێروتەسەل دادەنێت لە سەر چۆنێتی راوەستان بەرامبەر بە بەجیهانیکردن، لە گەڵ پەنانەبردن بۆ گۆشەگیریی یا ئەوەی ناودەبرێت بە بەرگری ئیجابی، واتە بەجیهانیکردن بەرامبەر بە بەجیهانیکردن.

جۆناسان فریدمان دەڵێت: لەم ساڵانەی دواییدا تاڕادەیەك نووسراوی زۆر دەرچووە لەسەر بەجیهانیکردن، وەکو دەردەکەوێت وتووێژیش لەو نووسراوانەدا چڕدەبێتەوە لەسەر لایەنی سروشتی قوچەکیی ئیمپریالیزم، واتە دەسترۆیشتنی رۆشنبیرییەکی ناوەندیی دباریکراووبڵاوبوونەوەی بەهاو شمەكوجۆری ژیانی ئەمریکایی، لەزۆر لەوتووێژەکانیشدا بە ناوی ئیمپریالیزمی رۆشنبیریی ئاماژەی بۆ کراوە[7].

کەواتە ملکەچبوون بۆ شێوازی دیموکراسی ئەمریکی، یا سیستمی بازاڕی ئەمریکاو دژایەتی نەکردنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکاو پێدانی مۆرکی ئەمریکایی بۆ رۆشنبیرییو پێناسو راگەیاندنو ئابووریو شێوازی بیرکردنەوەو رەفتارو بەکاربردن, یا دژایەتی توندڕەوی لە روانگەی ئەمریکاوەو دەستگرتن بەسەر بۆشاییەکانی ئاسمانو پەخشکردنی وێنەو فیلمی ئەمریکی لە رێگای مانگە دەستکردەکانەوە, کاکڵەی بەجیهانیکردنی

---

[1] المصدر نفسه، ص١٥٠، نقلا عن: الثقافة والامبريالية للدكتور ادوارد سعيد، ص ٦.

[2] حسن قطامش: نهاية الجغرافية، سيادة الدولة ام سيادة العولمة، مجلة البيان، عدد ١٤٩، محرم ١٤٢١ هجري، ص٩٥.

[3] نفس المصدر، ص٩٤.

[4] اعاقة الديموقراطية، الولايات المتحدة الامركية، مجلة المستقبل العربي، ص٢٨ .

[5] محمد فهيم يوسف: المصدر السابق، ص٢٩ .

[6] العولمة والاستراتيجية السياسية.

[7] مايك فيدرسون واخرون: ص٩٤ .

شارستانیەتێکە کە ئەمڕۆ ئەمریکا سەرۆکایەتی دەکات[1].

ئەمریکا نەسڵدەکاتەوەو نە شەرم دەیگرێت بەرامبەر گەلانی جیهان، ئەمریکا هیچ نابینێ لەو دەسەڵاتداریە بەجیهانیکردنەی، جگە لە باڵادەستبوونی و بڵاوکردنەوەیەکی سروشتیی نموونەکەی.

جهینو دەڵێت: ئەوەی گومانی تێدا نییە، بەجیهانیکردن بە بۆچوونی زۆر لە ئەمریکیەکان سنوورێکی نوێیە لە جیهانی ئابووریدا دروست دەبێت، دووپات بوونەوەو بەردەوامی ئەزموونی ئەمریکایە لەسەر ئاستی جیهان لە ڕێگای وردەوردە فراوانبوونی لەو بوارەدا[2].

گومانیشی تێدا نییە، ئەوەی ئەم تیۆری خۆبەزلزانینەی قوڵکردۆتەوە لەم سەردەمەی نوێدا، فەلسەفەی سوودە (پراگماتیزم) کە لە سەرەتای ئەم سەدەیەوە حوکم دەکات بەسەر ژیانی ئەمریکیەکاندا. ئەوەی نیشانە پەروەردەییەکانی ئەمریکای ڕوونکردۆتەوە (جۆن دیۆی)یە.

توێژەرێك پرسیار دەکاتو دەڵێت: ئەو هۆکارانە چییە کە ئەمریکای کردۆتە گەورەی جیهان, بیٚ دەوڵەتە ئەوروپاییەکانی تر کە هاوپەیمانن؟

بە بۆچوونی من لە ئەنجامی ئەوانەی خوێندومەتەوە هۆکارەکان بریتیە لە:

یەکەم: ئەمریکا کارتە مرۆییەکانی گەورەیە، هەر لە دامەزراندنیەوە دوور لەوەی کە لە کیشوەرەکانی تردا ڕوودەداتو لەناوبردنی دڕندانەی شارستانیەتە ڕەسەنە ئەمریکاییەکانیش هەڵقوڵاوی خۆیەتی، بەهۆی کەنارگیریشیەوە لە ڕووی جوگرافیەوە، تووشی جەنگی وێرانکە نەبووە، کە دامەزراوە نەتەوەیی و ژێرخانیەکانی کاول بکات. بەڵکو تەنها لە کۆتا ساڵەکانی جەنگی یەکەمو دووەمی جیهانییدا بەشداربووە، ئەویش لەکاتێکا کە بۆی دەرکەوت جەنگ لە قازانجی هاوپەیمانانە. بەو شێوەیە بەری سەرکەوتنی دەچنیو سەرکردایەتی دەوڵەتانی هاوپەیمانانیشی دەکرد کە جەنگەکە هیلاکی کردبوون، بە تایبەتی ئەو یەکەم هێزی ئەتۆمییە کە جەنگی بردەوە لە یابان, دوای ئەوەی ئەو هێزە ئەتۆمییەی لە ئەڵمانیا دزی لەگەڵ کۆتایی جەنگدا.

دووەم: هێزی گەورەی ئابووری ئەمریکا، کە دەستی گرتووە بەسەر ڕێژەیەکی زۆری ئەنجامەکانی ئابووری جیهاندا، بە هۆی کۆمپانیا زەبەلاحەکانیشەوە سامانێکی بێشوماری هەیەو دەستیشی گرتووە بەسەر بانق و سندوقی دراوی نێودەوڵەتی و ڕێکخراوی بازرگانی جیهانیشدا.

بۆ نموونە: کۆی گشتی بەرهەمی ویلایەتە یەکگرتووەکان کە ژمارەی دانیشتوانی (٢٦٥) ملیۆن کەسە، دەگاتە نزیکەی (٦١٦ ترلیۆن دۆلار), واتە نزیکەی نۆ ئەوەندەی بەرهەمی جیهانی ئیسلامیی کە دانیشتوانەکەی نزیکەی (ملیاروچارەکێکە)و داهاتیان لە (٧٣٥)ملیار دۆلار تێناپەڕێت ساڵانە[3].

سێیەم: دەستڕۆیشتنی ڕاگەیاندن بەسەر تۆڕەکانی پەیوەندیکردنی ئاسمانیی جیهانداو بەرهەمی بەلێشاوی شریتی گۆرانیو فیلمی سینەمایی، لەو بوارەشدا شەش کۆمەڵی سەرەکیی گەورە هەیە لە بواری چالاکیی ڕاگەیاندندا لەسەر ئاستی جیها ن کاردەکەنو لەهەموو جیهانیشدا هەمیشە ئامادەن، لەوانە چواریان ئەمریکایین، یەکێکیان ئەوروپاییەو, یەکێکیشیان ئوسترالی ئەمریکاییە[4].

چوارەم: دەسەڵاتی ئاشکرای بەسەر نەتەوە یەکگرتووەکانداو دامودەزگاکانیو ملکەچکردنی بڕیارەکانی بۆ بەرژەوەندی خۆیو بەکارهێنانی مافی ڕەتکردنەوە(ڤیتۆ) دژی هەر کێشەو گرفتێك کە بەدڵی ئەوان نەبێت. زۆریش نەڕۆیشتووم ئەگەر بڵێم نەتەوە یەکگرتوەکان هەڵدەستیٚ بە پەردەپۆشکردنی سیاسی دەسەڵاتی ئەمریکا لە هێرشکردنی بۆ سەر دەوڵەتە بچوکەکان, یا سەپاندنی ئابلۆقە بەسادەترین هۆ.

[1] احمد ثابت: العولمة والخيارات المستقلة، ص ٨ .
[2] امركة العالم او عولمة امريكا، ص ٨.
[3] ندوة الاقتصاد الإسلامي، مجلة البيان، عدد ١٥٢، ص٦٨.
[4] الدكتور مالك بن ابراهيم الاحمد: العولمة في الاعلام، مجلة البيان، عدد ١٤٨، ص١١٤.

پێنجەم: سەرکردایەتیی کردنی جیهانی رۆژئاوا دژی یەکێتی سۆڤێت لە ساڵەکانی جەنگی ساردا, بەوەی کە گەورەترین هێزی سەربازیو تەکنۆلۆژیای سەربازییە لە جیهاندا.

شەشەم: گەلی ئەمریکا گەلێکی خاوەن شارستانییەتی قووڵ نییە، پێکهاتەکەی لەوکاتەوە دەستی پێکردووە کە کۆچبەرانی ئەوروپایی لە ترسی چەوساندنەوەی ئایینیو سیاسی یا لەپێناوی سەروەتوسامانداا کۆچیان کرد بۆ ئەمریکا، تاکە ئاواتیشیان دەستگرتن بەسەر کیشوەری ئەمریکاو لەناوبردنی دانیشتوانەکەی بووە , ئەوانەی کە پێیان دەڵێن (هیندیە سوورەکان). کۆچبەرە قین لەدڵە تەماعکارە چەکدارەکان، بە چەکی نوێ هەرچی شارستانییەتی هیندیە سوورەکان بوو بە شێوازێکی زۆر خوێناویو ترسناك بەوپەڕی دڕندایەتیەوە هەموویان لەناوبرد, چونکە ئەو کۆچبەرانە هیچ بەهایەکی رەوشتیی مرۆڤایەتی بەرزیان نەبوو, لەدووتوێی رووداوی ئەو رۆژانەدا دەرونێکی دڵڕەقی یاخیان بۆ دروست بووە کە دەیەوێت بەهەر رێگایەك بێت سوودو قازانج بەدەست بێنێتو بێ ترسێکی ئایینی یا بنەمایەکی رەوشتیی دەست بگرێت بەسەر خەڵکی تردا[1].

حەوتەم: ئاشکرایە ملیۆنەها جولەکەی خزر، ئەوانەی کۆچیان کرد بۆ ئەمریکا، لەم سەدانەی دواییدا، خۆیان خزاندە ناو بواری ئابووریو راگەیاندنو سیاسەتو سەربازیی ئەمریکاوە، تا بەتەواوی دەستیان گرت بەسەر ئەو دامەزراوانەدا، بە تایبەتی ئەگەر بڵێی مەزهەبی پرۆتستانتی کە ئایینی زۆربەی ئەمریکاییەکانە، ئەو مەزهەبەی کە هەندێ لە توێژەران بە دەستکردی جولەکەی دەزانن لە ئەوروپادا. ئەوان خۆیان بە تایەفەیەکی جولەکە یا نزیك لەوان دەزانن. ئەوە زیادەڕەوی تێدانییە، بەڵگەی تەواویش لەسەر ئەوە بڵاوبوونەوەی تایەفەی ئینجیلی زایۆنیە لە نێوان زیاتر لە نەوەد ملیۆن ئەمریکاییدا، ئەو گروپەش پشتگیریی جولەکەو قەوارەی زایۆنی دەکەن بەوپەڕی تواناکانیانەوە[2].

گارودی نووسراوێکی بەڵگەنامەیی گرنگی نووسیوە، لە کتێبەکەیدا کە ناوی (العولمة)یە دەربارەی ئەو پەیوەندیە مێژووییە بەهێزە بەرژەوەندپارێزەی کە لە نێوان جولەکەو حکومەتەکانی ئەمریکادا هەیە تێیدا دەڵێت: پەیوەندی نێوان ئیسرائیلو ویلایەتە یەکگرتوەکان لە جۆری هاوپەیمانێتی ئاسایی نییە کە لەنێوان دەوڵەتاندا هەیە. لە نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکانو ئیسرائیلدا لەهەمان کاتدا یەکێتیەك هەیە لە بنەماو ئامانجەکانیاندا درێژدەبێتەوە بۆ لاهوتو سیاسەت، لەدیدو پەیوەندیشیاندا لەگەڵ جیهاندا، ئەوا هاوران لە هەر شتێك کە پەیوەندی هەیە بە گەلی هەڵبژاردە(جولەکە)وە، یا قەدەری ئاشکرای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا[3].

قەدەری ئاشکراش بیروباوەڕی ئەمریکاییە کۆنەکانە, کە گوایا ئەوان پەیامێکی ئاسمانیان پێیە، لەژێر ئەو چەترەشدا، چ ستەمێکیان بوێت لەجیهاندا دایدەڕێژن، مێژوونووسی ناسراوی ئەمریکا (جولبوت وبرات) دەڵێت: زۆر بەتایبەتکردنی قەدەری ئاشکرا بۆتە هاندەر بۆ دەستگرتن بەسەر هەر زەویەکدا کە ئەمریکا نیازو توانای داگیرکردنی هەبێت داگیری بکات[4].

ئەو وتارەی حاخامی گەورەی جولەکە لە واشنتۆن لە ناوەندی رۆشنبیریی ئیسرائیل پێشکەشی کرد، بەڵگەیە لەسەر کۆتایی هاتنی ئەمریکا لە باوەشی جولەکەدا، ئەو لە وتارەکەیدا وتی: بۆ یەکەمجار لە مێژووی ویلایەتە یەکگرتووەکاندا هەست بەوە ناکەین کە ئێمە لە دەربەدەریدا دەژین، هیچ کاتێك ویلایەتە یەکگرتووەکان حکومەتی (غۆیم)-جگە لە جولەکە-نەبووە, بەڵکو کارگێڕیەك بووە کە جولەکە لە بڕیارەکانیدا لەسەر هەموو ئاستێك پشکی تەواویان هەبووە. لەوانەشە شایانی ئەوە بێت کە پیاچونەوەیەك لەبارەی بەکارهێنانی دەستەواژەی حکومەتێ کە ناتوانرێت گرەوی لەسەر بکرێت لە شەریعەتی جولەکەدا بکرێت.

پاشان لە پاشماوەی وتارەکەیدا باس لە بەرژەوەندیی جولەکە دەکات، ئەوانەی بانگ کراون

---

[1] روجية غارودي: المصدر السابق، ص ٢١٠-٢١٦.

[2] السناتور الامريكي بول فندي: من يجرؤ على الكلام، االنبوة والسياسة.

[3] حسن خلوصي: الجذور الفكرية للتدخلات الامريكية في العالم، مجلة البيان، عدد ١٣٠، ص ٨٤.

[4] روجية غارودي: المصدر السابق، ص ٢١٥-٢١٦.

بۆ بەشداریکردن لە سیاسەتی ئەمریکادا لە رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا. پاشان دان بەوەدا دەنێت کە جولەکە دەستیان دەڕوات بەسەر وەزارەتی دەرەوەو هەواڵگری ناوەندیداو لە پانزە کەسی ئەندامانی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا حەوت کەسیان جولەکەن، پاشان دەڵێ: ئەو دەسەلاتو هەژموونە زۆرەی جولەکە هەیانە لەواشنتۆن، لە سنووری فەرمانگە حکومیەکاندا نەوەستاوە، بەڵکو لە میدیاکانی راگەیاندنیشدا زۆرە، ژمارەیەکی زۆر لە بەرپرسانی بەرنامە تەلەفزیۆنیەکان جولەکەن، ئەوانەی هاتووچۆی کڵێسا دەکەن، بەئاشکرا داوای کۆمەکی ئیسرائیل دەکەن[1].

جولەکە بەو هەموو هێزە ئابووریو راگەیاندنو پیلانگێڕییە نهێنیەی کە هەیانە، لە دووتوێی کۆمەڵە نهێنیەکانەوە کە لە ئەمریکاو ئەوروپا بلاوبوونەتەوە، زۆر لە دەوڵەتانی جیهان لە سەرکردایەتیکردنی ئەم بەجیهانیکردنەدا لەپشت ئەمریکاوەنو تەنانەت رێنماییشی دەکەن, کە هەندێ بەدرێژی لە لاپەڕەکانی داهاتوودا باسی دەکەین.

جولەکە، لە دەیەی نەوەدەکانی سەدەی بیستەمدا، ئەو دەیەی کە باڵەکانی بەجیهانیکردنی تیا دەرکەوت، بە تەواوی دەستیان گرت بەسەر سیاسەتی ئەمریکادا، ئەمەش بە مەبەستی بەڕێوەبردنی بەرژەوەندیی ئابووریانو دەستگرتن بەسەر سامانی جیهانداو بەکۆیلەکردنی میللەتانو پاڵپشتکردنی دەوڵەتەکەیان کە ناویان نا (ئیسرائیل).

## نەخشەکانی بەجیهانیکردنو ئەنجامەکانی

### بەجیهانیکردنی ئابووریی

کۆمەڵێك لە توێژەران وای بۆ دەچن کە بەجیهانیکردنی ئابووری جیهان هەر لە ساڵی (١٩٤٤)وە بەسەرکردایەتی ئەمریکا دەستی پێکردووە، لێرەوەش سندوقی دراوی نێودەوڵەتی پەیدا بوو, بۆ ئەوەی ببێتە پاسەوانی سیستمی دراوو بانقە نێودەوڵەتییەکانو نەخشەی لێشاوی دارایی درێژخایەن بکێشێت, هەروەها دروستکردنی رێکخراوی بازرگانیی جیهانیی کە بوو بە هۆی رێکەوتننامەی (گات), ئەوەی سیاسەتی بازرگانیی دەوڵەتە سەربەخۆکانی گۆڕی بۆ کاروبارێکی نێودەوڵەتیی نەك وەکو کارێکی سەروەریی نیشتمانیی بمێنێتەوە, ئەویش لە دووتوێی سیستمی دراوی نێودەوڵەتیداو تەحەکوم کردن بەسەر بزاوتی سەرمایەداریدا،هەروەها لە رێگای کۆمپانیا فرەڕەگەزەکانەوە کە ئەمریکا پشکی شێری هەیە لە ناویاندا.

بانقی نێودەوڵەتیی بە ئاراستەکردنی لەلایەن ئەمریکاوە زۆر لە دەوڵەتانی ئیسلامیی –بۆ نموونە– ناچارکرد کە پەیکەری ئابوورییان بەپێی ئەو سیاسەتە ئیمپریالیستیە بگۆڕن، ئەو دەوڵەتانە لە رێگای بەکارهێنانی بازاڕی ئازادو ئەوەندەی کە پێویستە خاوەنداریێتی گشتی بچوك بکرێتەوەوجیاوازیی کۆمەلأیەتیش بەرەو زیادبوون بڕواتو بەبارمتە کردنی نەوەکانی داهاتوو بە قەرزی دەرەکی، روویان کردە دەرەوە بۆ هێنانی سەرمایەی بیانییو گرتنەبەری چەمکی کەرتی تایبەت[2].

لەکاتێکدا کۆمەڵێك تیۆرسینانی ئەمریکایی کۆبوونەوەو کۆمەڵە بۆچوونێکیان بۆ جێگیرکردنی دەسەلاتی ئەمریکا بەسەر جیهاندا خستەڕوو, ئەو سیاسەتە ئابوورییەی دوایی بەتەواوی بڕیاری لەسەر درا.

١– بەکارهێنانی بازاڕی جیهانیی وەکو هۆکارێك بۆ تێکدانی هاوسەنگیی لە دەوڵەتە نەتەوەییەکاندا.

٢– بازاڕ بواری ململانێیە، واتە کردنەوەی بوار بۆ زاڵبوونی کۆمپانیا فرەڕەگەزە زەبەلاحەکان بە مەبەستی سەپاندنی شێوازێکی ئابووری دیار بەسەر ولأتانی تردا بێ گوێدانە بەرژەوەندی هەژاران.

ئەو کۆمپانیا زەبەلاحانە، بەپلەی یەکەم پێکدێت لە کۆمپانیای ئەمریکاییو ئەوروپاییو یابانی، کە هەمووشیان هاوکاری یەکترن[3].

[1] المصدر نفسه

[2] سيف بن علي جروان : عولمة السوق العربية المشتركة، المستقبل العربي، عدد ٢٤٩، تشرين الثاني ١٩٩٩، ص١٤٢–١٤٣ .

[3] الدكتور نجيب عزاوي: المصدر السابق، ص٤٣ .

لێرەدا دەتوانین ئامارێکی سەرەتایی بۆ هێزی ئەو کۆمپانیا فرەڕەگەزانە بخەینەڕوو، (٣٥٠) کۆمپانیای گەورەی ئەو دەوڵەتانە ڕێژەی ٤٠٪ی بازرگانی نێودەوڵەتییان بەدەستەوەیە. پشکی سەدیی گەورەترین (١٠) کۆمپانیای لە کەرتی پەیوەندیکردنی تەلدارو بێتەل دەگاتە ٨٦٪ی بازاڕی جیهانیی. ئەو ڕێژەیە گەیشتە ٨٥٪ لە کەرتی قەلاچۆکەران، نزیکەی ٧٠٪ لە کەرتی کۆمپیوتەر، ٦٠٪ لە کەرتی دەرمانی ڤێتێرنەری، ٣٥٪ لە کەرتی داوودەرمان، ٣٢ ٪لە کەرتی تۆوی کشتوکاڵیی[1].

لە نوێترین لێکۆڵینەوەدا لە بارەی گەورەبوونی ڕۆڵی کۆمپانیا فرەڕەگەزەکانو زیاتر بوونی هێزی ئامارییان، جۆن کافاناح و سارە ئەندرسۆن ئاماژە دەکەن بۆ:

– فرۆشراوی گەورەترین دووسەد کۆمپانیای جیهانیی زیاترە لە قازانجی چالاکیی هەموو ئابووری جیهانیی.

– قەبارەی ئەو فرۆشراوانە زیاترە لە چالاکیی هەموو دەوڵەتان بە گشتی جگە لە نۆ دەوڵەتی پیشەسازیی، واتە فرۆشراویان زیاترە لە فرۆشراوی (١٨٢) دەوڵەت.

– سامانی ئەو (٢٠٠) کۆمپانیایە دەگاتە دوو ئەوەندەی کە ( ٤/٥ )ی هەموو هەژارانی جیهان هەیانە.

– پێنج کۆمپانیا لە گرنگترین کۆمپانیاکانی پیشەسازییئوتومبێل لە جیهاندا تەنها خۆیان دەستیان گرتووە بەسەر فرۆشراوی ٦٠٪ هەموو ئوتومبێلی جیهاندا.

– پێنج کۆمپانیا لە گەورەترین کۆمپانیاگەلی ئەلکترۆنی دەستیان گرتووە بەسەر ٥٠٪ی هەموو فرۆشراوەکانی ئەو بوارەدا.

– هەروەها ٣٠٪ کۆی فرۆشراوەکانی کۆمپانیاکانی فڕۆکەوانی، ئاسمان بڕین، تەقەمەنی، پەترۆڵ، زانیاریورد، کیمیاو راگەیاندن، هی پێنج کۆمپانیای فرەڕەگەزی گەورەیە[2].

گومانی تێدانییە ئەو پاوانکاریانە دەبێتە هۆی دروستکردنی دیوار لە نێوان گەلانداو دەشبێتە هۆیەك بۆ دەست بەسەراگرتنو دەستڕۆیشتن بەسەر سەرچاوەکانیاندا.

لە پێناو چڕبوونەوەی سامانی جیهان لە دەستی سەرمایەدارانی چاوچنۆکدا کە خاوەنی ئەو کۆمپاناگەلەی ئەمریکاو هاوپەیمانەکانیەتی، کۆمپانیا زەبەلاحەکان لە سنووری (١٥) تۆڕدا خاوەنی راستەقینەی ئەو تیۆرەن کە دەڵێت: بەرهەمهێنانی زۆرترین شمەكو دروستکراو بە کەمترین کرێکار[3].

لە ئەنجامی ئەو سیاسەتەشدا، بەجیهانیکردنی ئابووری بە کردنەوەی بازاڕەکانی جیهان، بە ڕووی بەرهەمەکانی ئەوروپادا بێ کۆسپو یاسا کۆتایی دێت. بەو شێوەیەش بەرهەمی خۆماڵیی ناتوانێ ململانێی بەرهەمە بیانییەکان بکات، ئەوەش دەبێتە هۆی پەککەوتنی زۆر چالاکیی ئابووری نیشتمانیو فرۆشتنی ژێرخانە ئابووریەکانیش بە کۆمپانیا جیهانیەکان، بە بیانووی چاکسازیی ئابووری کە مەبەستی خوازراوە. ئەوەش خۆبەدەستەوەدانی تەواو بە سیاسەتی ئیمپریالیزمی ئەمریکا بەدیدێنێ[4].

ئەو کۆمپانیاگەلە هەموو سەرزەوی بەوەشەوە کە تیایەتی لە شمەكو لە مرۆڤی بە بازاڕی خۆیان دەزانن، ئەوان لە ناو خۆیاندا بێ گوێدانە هیچ بەهاو ڕەوشتێك خەریکی ململانێن لە سەر دابەشکردنی زەوی[5]. بێئەوەی هیچ جۆرە ئینتیمایەکیان هەبێت بۆ هیچ دەوڵەتێکی نەتەوەیی، بەپێی بەرژەوەندیەکانیان لە هەر بازاڕێکی هەسارەکەدا بێت جێگای خۆیان دەکەنەوە[6]. ئەوەش بە دەگمەن دەچێتە شێوازی وەبەرهێنانێکی راستەوخۆی درێژخایەنەوە، بەڵکو دەچێتە چوارچێوەی ئەوەی کە پێی دەڵێن سامانی فریو لە وەبەرهێنانی کورتخایەنو قازانجی بەپەلەو بێشومار، بێ

[1] نهاية الجرافية، مجلة البيان، ص١٠٢.

[2] اية العولمة، ٤٦–٥٤؛ قضايا الفكر العربي، ص١٤٢.

[3] خالد ابو الفتوح: العولمة حلقة في تطور اليا ت السيطرة، مجلة البيان، عدد ١٣٦، ابريل ١٩٩٩.

[4] نهاية الجغرافية، ص١٠٣.

[5] مسلالة العولمة، ص٢٨٧؛ اية العولمة، ص٤١.

[6] طوفان العولمة واقتصادياتنا المسلمة، مجلة البيان، عدد ١٥١، ص٧٢.

ئەوەی هیچ داهاتێکی بۆ پەرەپێدانی نیشتمانی تێدابێت.

خۆ ئەگەر رویداو وەبەرهێنانی راستەوخۆ کرا، ئەوە لەپێش ئەوەدا ئاسانکاری‌و زەمانەتی سیاسی‌و ئابووری بۆ کراوە، هەڵبەتە ئەو ئاسانکارییە بۆ سەرمایە خۆماڵیەکان ناکرێت، ئەوەش کۆسپێکی گەورەیە لە رێگای ئابووری وڵاتدا، زیاد لەوەش لە ئەنجامی ئەو شێوازی بەکاربردنەدا کە باوە زۆربەی چالاکییەکانی کۆدەبێتەوە لە شمەکی بەکاربردنی قازانجی خێرادا. ئەمەش مانای وایە ئەو کۆمپانیاگەلە لە رێگای هەڵخەڵەتاندنی بەکاربەرانەوە هەڵدەستن بە مژینی زیادە داراییەکان لەلای بەکاربەران (هاووڵاتی)[1].

لێرەدا دەتوانین بڵێین زۆربەی ئەو گەندەڵیەی لە جیهانی سێدا بڵاوبۆتەوە، دەستکردی ئەو کۆمپانیا فرەڕەگەزانەیە کە بارەگاکانیان لە دەوڵەتە پیشەسازیەکاندایە، هەموویان بە مەبەستی بەدەستهێنانی مامەڵە ئابووریەکان بە هەمیشەیی کاردەکەن بۆ بڵاوبوونەوەی بەرتیلی زۆر بۆ بەرپرسانی دەوڵەتە جیاجیاکان[2].

بەوەش جیهان دەبێتە بازاڕێکی بەکاربردن بۆ بەرهەمی دەوڵەتە پیشەسازیەکان لەسەرو هەموشیانەوە ئەمریکا, ئەوەش داردەستێکی ئیمپریالیزمییە بەدەستی حکومەتە جیهانییە نهێنیەکەوە کە دامەزراوی خۆی هەیە وەکو بانقی نێودەوڵەتی‌و سندوقی دراوی نێودەوڵەتی‌و ڕێکەوتننامەی بازرگانیی ئازاد[3].

بەو پێیە ئەنجامی ڕاستەوخۆی بەجیهانیکردن نایەکسانیە, ئەمەش واتا کوێرەوەری‌و ڕەجاڵی‌و نەبوونی دیموکراسیەت‌و لەناوچوونی هەموو خەونێکی خۆش گوزەرانیی, ئەوەش نیشانەی جیاکەرەوەی سیستمی بەجیهانیکردنە لەووڵاتانەی کەوتۆتەداویەوە[4].

هەر وڵاتێك بەجیهانیکردن داگیری بکات لەوانەیە تووشی ئەم کارەساتانە ببێت: بڵاوبوونەوەی هەژاریی، نەمانی بەهای کاری مرۆڤ، ئاراستەیەکی وێرانکەر کە هەلی کار لەناو دەبات, بڵاوبوونەوەی بێکاری، کۆمەڵگا دابەشدەبێت بۆ کۆمەڵگای دەوڵەمەندە مشەخۆرەکان کە خزمەتکاری کۆمپانیا فرەڕەگەزەکانن، لەگەڵ زۆربەی هاڕاوەکان کە خێرو بێریان دزراوە بۆ ئەوەی بچێتە گیرفانی سەرمایەدارانی دڕندەوە کە سەرمایەی (٣٥٨) کەس لەوان لە رۆژئاوادا هێندەی ئەوەیە کە (٢,٥) ملیار کەسی سەرزەوی هەیانە.چونکە سیستمی بەجیهانیکردن رێژەی پێویستی کرێکار کەمدەکاتەوە بۆ ٢٠٪ واتە ٨٠٪ بێکار دەبن، ئەمەش ئەوەیە کە بەجیهانیکردن پێی دەڵێت کۆمەڵگای پێنجیەك[5].

ئەو ئەنجامەی پسپۆڕان لە توێژینەوەکانیان دەربارەی بەجیهانیکردن پێیگەیشتوون بریتییە لە: ئەگەر جاران پەرەپێدانی ئابووری هەلی کاری دروست دەکرد، ئێستا پەرەپێدانی ئابووری لە سایەی بەجیهانیکردندا دەبێتە هۆی کەمکردنەوەی هەلی کار، چونکە هەندێ کەرتی بواری ئەلکترۆنات‌و راگەیاندن‌و پەیوەندیکردن کە کەرتە زۆر رەواجدارەکانن لە جیهاندا، پێویستیی زۆر کەمی بە کرێکار هەیە. لەسایەی بەجیهانیکردندا، پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیا دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی بێکاریی، ئەوەش بێگومان دەبێتە هۆی کێشەی سیاسیی[6].

(بۆل بیرۆخ) دەرەنجامی توێژینەوە بەنرخەکەی دەربارەی بنەما ئابووریەکانی بەجیهانیکردن، لەم خاڵانەی خوارەوەدا کورت دەکاتەوە:

١ – بێکاریی زۆری پەیوەندار بە بنیاتی ئابووری سیاسییەوە .

٢ – بوونی جیاوازیەکی زۆر لە دابەشکردنی داهاتدا.

٣ – هەڵگەڕانەوەیەکی توند لە کارکردندا(العمالة).

---

1 الدكتور محمد امخزون : المصدر السابق، ص١٢٤ .

2 المصدر نفسه، ص١٢٢ .

3 تركي علي ربيعي: تأملات في عصر العولمة، مجلة تروى، ص٧٣ .

4 هانس بيتر مارتين وهارولد شومان: المصدر السابق، ص٢٨ .

5 الدكتور محمد عابد الجابري: المصدر السابق .

6 الثقافة العالمية، ص١٠٤ .

٤– گەشەکردنی سلبی لە بارودۆخی نەشارەزایان، بۆ نموونە موچەی کەمو ونبوونی وەزیفەکان.

٥ – هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتی زامنکار.

٦ – هەڵوەشاندنەوەی خزمەتگوزارییە گشتییەکان[1].

پوختەی قسەش، بەجیهانیکردن کە راستەوخۆ لەلایەن ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی لە جولەکەو ئەورووپییەکان بەڕێوە دەچێت لە ڕێگای ئابوورییەوە زاڵ دەبێت بێت بەسەر گەلاندا, پشت ئەستورە بە بەکارهێنانی پێویستییە بەکاربردنەکانو کوشتنی دەستپێشخەرییە نیشتمانییەکانو سەرکردایەتیکردنی نەخشە دۆزەخییەکان بۆ ئاراستەکردنی سامانەکانو پەیکەردارکردنی ئابووری، ئەمەش بە دەستێوەردانێکی ڕاستەوخۆ لەو دامەزراوە بازرگانییە ژێر دەستانەوە دێتەدی کە لە قەرزو سوودی قەرزەکاندا چەقیونو ناتوانن لێیان دەربازبن. هاوکات ملکەچکردنی دەوڵەتی نیشتیمانیو داگیرکردنی فکرو ڕۆشنبیریی لە ڕێگای کەناڵە ئاسمانییە گەردوونییەکانەوە کە سەدان مانگی دەستکرد پەخشی دەکەن، شانبەشانی پلانە ئابوورییەکە دەڕۆن و هاوکاری بەدیهێنانی ئەو ئامانجە دەکەن .

## بەجیهانیکردن و دەوڵەتی نیشتمانیی

پرۆفیسۆر رۆجیە گارودی دەڵێت: رەوتی زاڵ لە ریزی ئابووریناسە رەسمیەکانو سیاسییەکان, بیٚ سنوور خەریکی بەرگریکردنە لە لیبراڵیەت, بۆ ئەوەی هیچ کۆسپێکیش نەمێنیٚ لە بەردەم دەسەڵاتی داگیرکردنی ئابووریدا، داوای ونبوونی دەوڵەت لە بەردەم دەسەڵاتی رەهای بازاردا دەکات[2]. چونکە بەجیهانیکردن پێویستی بەوەیە دەست بگرێت بەسەر دەوڵەتی نیشتمانیداو یاساکانی ملکەچ بکات بۆ جوڵەو ئازادی ئەوان لە کاردا.

بەو شێوەیە بەجیهانیکردنی هاوچەرخ دەبێتە هۆی بێبەشبوونی دەوڵەتەکان لە مافی سەروەریی ڕەها, بۆ گەیشتن بە چەمکێکی نوێی سەروەریی کە چڕدەبێتەوە بەسەر جیهاندا بە گشتی بە سیفەتی یەکێتیی سیاسیی کە جێگای دەوڵەتی تەقلیدیی باو دەگرێتەوە[3].لە ئەنجامی ئەوەشدا سەروەریی دەوڵەت بە مانا بنەڕەتیەکەی ئێستا سەرلەنویٚ لەڕێگای هێزەکانی بەجیهانیکردنو دەسەڵاتە نێو دەوڵەتییەکەیەوە پێناسە دەکرێتەوە .

سەروەریی لەو پێناسەیەدا بریتییە لە ئیرادەیەکی نێودەوڵەتیی کە نەخشەیەکی نویٚ دەکێشێت بۆ جیهان کە بگونجێت لەگەڵ بۆچوونە جیهانییەکاندا, ئەو نەخشە نوێیەش سنوورێکی تایبەتی بۆ دەوڵەتەکان تێدا نییە، بەڵکو جیهان هەمووی دەبێتە یەك بارستایی هاوکارو هاوشانی یەکترو لەیەکرازیو سەلامەتو ئارام.

هەروەکو بە ساختەوا دەڵێن و ڕاستیەکەش بە تەواوی پێچەوانەی ئەوواقیعەیە کە بەجیهانیکردنو چنگەکانی زاڵەبەسەرید[4].

لەوانەیە توێژەرێك بپرسێتو بڵێت: ئایا دەوڵەتی نیشتیمانی لە سایەی بەجیهانیکردندا دەمێنێتەوە؟

دەڵێین: بەڵیٚ دەوڵەت لە سایەی بەجیهانیکردندا دەمێنێتەوە. وەکو ئیدارەیەکی گشتیی نویٚ، واتە دەگۆڕێت بۆ حکومەتی کارەکان کە لاوازیی دەوڵەتو دەستورەکەی تێدایە, لە ئەنجامی ئەوەشدا ئەو دەوڵەتە هەوڵ دەدات لەسەرحسابی کارەکانی تری متمانەی بازاڕە جیهانییەکان بەدەستبێنێت[5].

بەڵام ئایا کارەکانی تری چییە؟

نووسەرانی کتێبی (فخ العولمة) وەڵامان دەدەنەوەو دەڵێن: ئەوان –کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان– هەڕەشەی ڕاگرتنی سەرمایەکانیان دەکەن ئەگەر حکومەتەکان گویٚ بۆ داخوازییەکانیان نەگرن, داخوازییەکانیشیان بریتیین لە کەمکردنەوە

---

[1] سيار الجميل: المصدر السابق، ص٤٦ .

[2] تركي محمد: السيادة في عصر العولمة، جريدة الشرق الاوسط، عدد ٧٤٣٩ .

[3] سيادة الدولة ام سيادة العولمة، مجلة البيان ، ص٩٤.

[4] نهاية الجغرافية، ص٩٥.

[5] هاتس بيتر مارتين وهارولد شومان: المصدر السابق، ص١٠، ١٥–١٦ .

یا دەستهەڵگرتن لە باج, پرۆژە ژێر خانیەکانیان بەخۆرایی پیٚ ببەخشرێت, ئەو یاسایانەش هەڵبوەشێنرێتەوە کە هەندێك دەستکەوتیان بەدەستهێناوە بۆ کرێکارانو چینی ناوەندیی، وەکو یاساکانی لای کەمی کریٚ، پرۆژەی دابینکردنی کۆمەڵایەتی, تەندروستیو کۆمەکی بێکاریی, بەشێوەیەك کە بەشداریی داراییان لەو کاروبارانەدا کەم بکاتەوەو پرۆژەکان بکەن بە کەرتی تایبەتو زۆر خزمەتگوزاریی گشتیش کە حکومەتەکان پێی هەڵدەستان بگۆڕن, بۆ ئەوەی کەرتی تایبەت پێی هەڵبستیٚو مۆرکی بازرگانیی بدرێت بە سەریا[1].

بە کورتی, لە سایەی بەجیهانیکردندا, کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان دەبن بە دەوڵەتی راستەقینەو هەڵدەستن بە هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەتەکانو سەرلەنویٚ بنیاتنانەوەیان, دەخوازن لە ژێر فشاری سەرمایەداریی پاوانکاردا وایان لێبکەن دەست لە مافو سنووری جوگرافیو ئەرکی سەرشانیان بەرامبەر بە کۆمەڵگاکانیان هەڵگرن, ئەمەش بە هیوای دروستکردنی دەوڵەتێکی جیهانی, کە خاوەن پاوانکارییە جیهانییە چاوچنۆکەکانی جولەکەو ئەمریکاو هاوپەیمانە ملکەچەکانیان سەرکردەو سەرۆکیان بن, ئەوانەی لە کۆمەڵگا مرۆڤایەتییەکاندا بۆ مژینی خوێنی گەلانی هەژارو ڕەنجدەرو کوشتنی هەستی نیشتمانیان ملکەچی ڕێنماییەکانیانن, ئەو هەستە سەرەتاییە ئابووریناسی بەجیهانیکردنی بەناوبانگ (لیندبێرگ) بۆ ئەوانە هەمووی ئەم ناونیشانەی هەڵبژارد بۆ کتێبەکەی (کۆتایی دەوڵەتی نەتەوەیی) کە لە ساڵی ١٩٩٥دایینابوو[2].

## بەجیهانیکردنی ئاسمانی گەردوونیی

بەوپێیەی بواری بەجیهانیبون هەموو گۆی زەوییە, ئەوەی کە گۆڕیویانە بۆ –وەکو دەڵێن– گوندێکی گەورە, ئەمەش لە ڕێگای سەدان مانگی دەستکردەوە کە بە ئاسمانی زەویدا دەخولێنەوە بەڕێوەدەچێت, ئەو کەناڵانە ڕۆژانە بەرنامەی هەمەڕەنگ بۆ هەموو خێزانێك لە خێزانەکانی وڵاتانی جیهان پەخش دەکەن, بۆ ئەوەی تەلەفیزیۆن ئەنتەرنێتەکان وەریبگرن, دواجار دەسەڵاتێکی تەکنۆلۆژیای خاوەن سیستمی ئاڵۆز کە داننانێت بە سنووری نیشتیمانی یا ئاسمانیی یا دەرییایدا, کە تۆڕگەلێکی پەیوەندیکردنی زانیاری لە ڕێگای سیاسەتی بەجیهانیکردنو ئابووریەکەیو ڕۆشنبیریەکەیو فکرەکەییو سیستمە کۆمەڵایەتییەکەی سەرکردایەتی دەکات, مەبەستێتی جیهانێکی نویٚ دروست بکات, بیٚ پرسکردنو بیٚ جیاوازییو بیٚ چاودێر لە دەوڵەتەوە یا لە میللەتو ئایین یا نیشتیمانەوە خۆی بخزێنێتە عەقڵو دڵو دەروونی هەموانەوە.

ئەو تۆڕانە کە زۆربەیان هی سەرکردەکانی بەجیهانیکردنن، هی سەرمایەدارە پاوانخوازە ئەمریکاییەکانو کەسانێکن کە بەدەوریدا دەخولێنەوە, بۆ ئەوەی مێشكو یادەوەریی گەلان بشۆنەوەو خاڵی بکەنەوە لە ئیتیماو ڕەسەنایەتیو ڕۆشنبیریو سیستمی کۆمەڵایەتیان, تا پەکیان بکەوێت لەبەردەم شتە هەڵخەڵەتێنەکانی ژیانی سەرمایەداریی ئەمریکاییو شێوازە کۆمەڵایەتییو ڕەوشتیەکانیی وەکو بیرکردنەوەو جلوبەرگو خواردنو ڕابواردنو خەونو بەهاو ئارەزو, بە شیوەیەك کە بە ئاسانیی جۆرێکی دیاریکراو لە شمەكو کارگوزاریو بیر جێگیربکەن، ئەو شێوازەی کە ملکەچی سیستمی بەجیهانیکردنەو دەیانەوێت ببێت بە باو لە جیهاندا[3].

ئەوەی میدیا ئاسمانیەکان دروستی دەکەن, گواستنەوەی ڕۆشنبیریی نیشتیمانی و نەتەوەیی نییە بۆ ڕۆشنبیرییەکی بەرزی نویٚ, بەڵکو تاڵانکردنی ڕۆشنبیرییو دەستدرێژییە بۆ سەر هەموو ڕۆشنبیرییەکان. بە بۆچوونی دکتۆر عەبدولڵا بەلقەزیز ئەوە هاوشانی تێپەڕاندنێکە کە بەهێزی چەك دەکرێتو هەڕەشە لە سەروەریی ڕۆشنبیریی هەموو ئەو کۆمەڵگایانە دەکات کە دەستی بەجیهانیکردنی گەیشتۆتیٚ. ئەوەش ڕۆشنبیرکردن نییە وەکو خوازیارانی

---

[1] احمد عبد الغفور: العولمة المفهوم المظاهر المسميات، مجلة العلوم الاجتماعية، عدد الاول، مجلد ٢٦ .

[2] اعلام العولمة، المستقبل العربي، ص٧٦؛ مستقبل العولمة، ص١٧ .

[3] المستقبل العربي ، ص٢٢٩ .

بەجیهانیکردن دەڵێن, چونکە خۆرۆشنبیرکردن واتە گوێگرتنی هاوشان لە نێوانیانداو داننانیش بە مافی جیاوازیدا، ئەوەی کە پیرۆزترین مافی مرۆڤە –لە کاتێکا– زۆرکاریی‌و توندڕەوی رۆشنبیریی رەتکردنەوەو وەلاخستنی رۆشنبیرییەکانی ترو خۆبەزلزانین‌و ناوەندێتی خودیی لە دیدی رۆشنبیریاندا هەیە[1].

هەروەها دکتۆر مونیر ئەلحەمەش، بۆ ئەوە دەچێت کە رووی رۆشنبیریی بەجیهانیکردن لە لایەنە ئابووری‌و سیاسیەکەیەوە تاڵترە، ئەگەرچی تەواوکەری ئەو لایەنەیە، چونکە سوود لە ئامێرەکانی پەیوەندیکردن‌و تەکنۆلۆژیای پێشکەوتوو وەردەگرێت, کە بەهۆی ئیمپراتۆریەتێکی راگەیاندنی فراوانەوە رۆشنبیریی بازاڕو بەکاربردن لە رێگای دەنگ‌و رەنگەوە لەسەر حسابی خوێندنەوەو کتێب پەخش دەکات[2].

لەبەر بایەخی بەجیهانیکردن‌و وتوێژ لەسەر کێشەکانی‌ئەو بوارە ترسناکە، چوار کۆنگرەی نێودەوڵەتی بەستراوە (جنێف ١٩٩٢, بۆنیس ئایرێس ١٩٩٤، برۆکسل ١٩٩٥، جۆهانسبرك ١٩٩٦ )، ئەمریکیەکان لەو کۆنگرانەدا لە ناردنی بیرۆکەکەیان دەبارەی کۆمەڵگای زانیاریی جیهانیی یا فشارکردن بۆ کردنەوەی سنووری زۆرترین ژمارە لە دەوڵەتان لە بەردەم لێشاوی زانیاریەکاندا سەرکەوتووبوون.

زانای ئەمریکایی (نعۆم چۆمسکی) دەڵێت: بەجیهانیکردنی رۆشنبیریی هەنگاوێکی جۆرایەتییە (نوعیة) لە مێژووی راگەیاندندا کە ناوەندێتی ئەمریکا بەسەر گەلاندا –بەسەر هەموو جیهاندا– بەهێزتر دەکات[3].

دەسترۆیشتویی ئەمریکا لە ئەنجامی ئەوەیە کە ٦٥٪ی کۆی کەرەسەو بەرهەمەکانی راگەیاندن‌و ئاگاداریییەکان‌و رۆشنبیریی رابواردن (ترفیە) لە ژێر دەستی ئەودایە. هەر ئەوەشە وایکردووە لە هەندێ وڵاتی ئەورووپیی لە نەوەکانی داهاتوویان بترسن.

لە کۆتاییدا بواری راگەیاندن خراپترین رووی بەجیهانیکردنە, خاوەنی بەرژەوەندییە ئابووریی‌و بازرگانییەکان بەتایبەتیش زایۆنییەکان دەستیان گرتووە بەسەر راگەیاندندا، لە رێگای تەوزیفی سامان‌و دەسەلاتی ئیداریی‌و هونەریەوە بۆ شێواندنی زانیاریمان لەسەر جیهان‌و هەستکردن بە خۆمان‌و ناسینی خەڵکی تریش بەکاری دەهێنن[4].

کەواتە بەجیهانیکردنی ئاسمانی گەردوونیی بە هەموو رەهەندەکانییەوە لە مەترسیدارترین کێشەیە کە جیهانی ئیسلامیی دەگرێتەوە، ئەمەش بەهۆی دەسەلاتی جولەکە زایۆنییەکانەوە بەسەر داموودەزگای راگەیاندن‌و پەیوەندیکردنداو هەرچیش لەگەڵیدا دێت، کە شێواندنی راستیەکان‌و لەناوبردنی نیشانەکانی شارستانیی ئیسلامیی لە بەردەم رای گشتی جیهان بەشێکی چالاکی ئەو بوارەن[5].

## بەجیهانیکردنی کۆمەلایەتیی

ئەو بنەمایەی جیهانی بەجیهانیکراو سەرچاوەی لێوە گرتووە، کردنی جیهانە بە گوندێکی گەردوونی کە ملکەچ دەبێت بۆ ئاراستەکانی ئەمریکای جولەکەیی. کەواتە گەیشتن بە یەك کۆمەڵگا، یەك شێوەو سیستمی کۆمەلایەتیی‌و یەك رەوشت، لە سەرەتاکانی بەجیهانیکردنە, چونکە داڕشتنی کۆمەڵگا بە داڕشتنێکی بەجیهانیکراو کاری لایەنە وێرانکارەکانی تری بەجیهانیکردنە, لەوانە بەدڕەفتارکردنی کۆمەڵگا، خاڵیکردنەوەی لە بەها رەسەنەکان‌و رەوشتە جوانەکانی هەڵقوڵاوی ئایینە ئاسمانییەکان‌و فیترەتی مرۆڤایەتی‌و مەنتقی عەقڵی ئاسان دەکات بۆ ئەوەی پیاوەتی‌و ئازایەتی‌و بوێریی بەرامبەر بە نەخشەکانی بەجیهانیکردنی سەرمایەداریی ئەمریکایی جولەکەی چاوچنۆك تیا نەمێنێ.

---

[1] العولمة ليس خيار الوحيد، الاهالي للطباعة والنشر، طبعة الاولى، دمشق ١٩٩٨، ص٤٨ .

[2] العولمة بين منظورين، مجلة البيان، ص١٢٥ .

[3] العولمة والخطر على الهوية والكيان، مجلة المعرفة، ص٤٣.

[4] المصدر نفسه .

[5] كمال حبيب: عولمة المراء، مجلة البيان، عدد ١٥٠، مايو ٢٠٠٠ .

تۆ بڵێی نەخشەی بەجیهانیکردن بۆ بەدڕەفتارکردنی کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتی چی بێت؟

ناوەندەکانی بەجیهانیکردن کە بەسەر نەتەوە یەکگرتووەکاندا زاڵە، چەندین جار بە تایبەتی لە دەیەی نەوەدەکاندا، بە مەبەستی گرتنی کۆنگرەگەلێك بە ناونیشانی جیاجیا بۆ گۆڕینی سیستەمی گشتیی لە کۆمەڵگاکاندا بە تایبەتی سیستەمی خێزان ئەو دەزگایەی هانداوە.

– نەتەوە یەکگرتووەکان ساڵی ١٩٥٠ هەوڵیدا یەکەم خولی کۆنگرەکان لەسەر خێزانو ئافرەت بە ناونیشانی (رێکخستنی خێزان) لە قاهیرە ئەنجامبدات، بەڵام حکومەتی میسر لەوکاتەدا رازی نەبوو لەسەر گرتنی ئەو کۆنگرەیە لەوێ.

– نەتەوە یەکگرتووەکان ساڵی ١٩٧٥ کۆنگرەی مەکسیکی بەست، لەو کۆنگرەدا داوا کرا تاوانی لە باربردنی منداڵ رەوا بکرێت, ئازادیی سێکسی بدرێت بە هەرزەکارانی نێرو مێ, رێکخستنەوەی خێزان بۆ سنووردانان بۆ دانیشتوانی جیهانی سێ، بەڵام ئەو کۆنگرەیەش شکستی هێنا.

– ساڵی ١٩٨٥ کۆنگرەیەك بە ناونیشانی (ستراتیژیەتی روانین بەرەوپێش لە پێناوی پێشکەوتنی ئافرەتدا) لە بەیروت بەسترا.

– ساڵی ١٩٩٤ کۆنگرەی دانیشتوانو پەرەپێدان لە قاهیرە بەسترا، لەوێدا داواکرا کە ژیانی ئافرەتو خێزان لە لایەنی ئایینیەوە بگۆڕن.

– ساڵی ١٩٩٥ لە ژێر ناونیشانی (یەکسانیو پەرەپێدانو رێکخستن) کۆنگرەی پەکین بەسترا.

– ساڵی ١٩٩٦ کۆنگرەی دانیشتوانو پەرەپێدانو رێکخستن لە ئەستانبوڵ بەسترا.

لە بڕیارە پێشنیارکراوەکانی ئەو کۆنگرە: سەپاندنی مافی مرۆڤ لە گۆڕینی پێناسی رەگەزیی (جنسی)و ئەو رۆڵانەی دەکەوێتە سەرشانی، بە رەسمی داننان بە (الشواذ والمخنثین)، داواکردنی تۆمارکردنی مافەکانیان لە ناو مافەکانی مرۆڤدا, لەوانەش پێدانی مافی هاوسەرگیریی لە ناویاندا, واتە هاوسەرگیریی نێر لەگەڵ نێرو مێ لەگەڵ مێو دروستکردنی خێزان لە نێوانیانداو بەدەستهێنانی منداڵ بە (تبني – بە منداڵی خۆت کردن–), یان بە بەکرێگرتنی سك(منداڵدان). بەڵگەنامەی بڕیارەکان داوا دەکات کە کچو ژن ئازادیی رابواردنی سێکسیان هەبێت لەگەڵ هەرکەسێك کە دەیانەوێت, جا لە هەر تەمەنێکدا بێت. مەرجیش نییە لە چوارچێوەی هاوسەرگیریی شەرعیدا بێت. هەروەها داوادەکات کچە عازەبە سکپڕەکان لەسەر خوێندنی خۆیان بەردەوام بن بێ ئەوەی کەس لۆمەیان بکات.

گارودی لە پەیامێکدا کە ئاراستەی کۆنگرەکەی کردبوو، ئامانجی بڕیارەکانی کۆنگرەی قاهیرەی رسواکرد، رۆژنامەی (الشعب) لە قاهیرە لە ژمارەی ١٦/٩/١٩٩٤دا بڵاوی کردەوە[1]. ئەوەی سەیرە سەرۆکی کۆمەڵەی (دایکە بچکۆلەکان لە ئەمریکا) لە کۆنگرەی قاهیرەدا موسڵمانەکان وریا دەکاتەوەو دەڵێت: کۆمەڵگای ئەمریکایان وێرانکرد, ئێستاش ئەو بیروبۆچونەیان دەهێنن بۆ کۆمەڵگا ئیسلامییەکان, بۆ ئەوەی وێرانی بکەنو رۆڵی ئافرەتی موسڵمان لە کۆمەڵگادا نەهێڵن[2].

لە نیویۆرکیش ساڵی ٢٠٠٠ کۆنگرەی جیهانیی ئافرەت بەسترا, دەوڵەتانی بەجیهانیکار لە سەرو هەموویانەوە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بڕیارە پێشووەکانیان پێشکەشکردو داوایانکرد بەسەر جیهاندا بسەپێنرێت. ئەو دەوڵەتانەش کە بڕیارە بێ ئابڕوییەکانی ئەو کۆنگرەیان مۆر کرد, پێویستە لە سەریان کە یاساکانیان بەشێوەیەك بگۆڕن، کە لەگەڵ ئەو بڕیارانەدا بگونجێت کە دەبێتە هۆی لەناوچونی خێزانو ئازادکردنی سێکسو بڕیاردان لەسەر (شذوذ)ونەهێشتنی دەسەڵاتی دایكو باوك لە خێزانداو ئازادکردنی لەباربردنی کۆرپەو هەڵوەشاندنەوەی سیستەمی میرات[3].

---

[1] الدکتور عبدالحسین سلمان جاد: وثیقة مؤتمر السکان والتنمیة رؤیة شرعیة، کتاب الامة ٥٣، ص٥٥– ٧٠.

[2] احمد منصور: سقوط الحضارة الغربیة رؤیة من الداخل، طبعة الاولی، دار العلم، دمشق ١٤١٨.

[3] وثیقة برامج عمل المؤتمر الاول للسکان والتنمیة المصدر ١٩٩٤، ص٥– ١٥.

بە مەبەستی پەلە کردن لە جێبەجێکردنی ئەو بڕیارانەی کە روخێنەری سیستەمی ئایینی چاودێری خێزانن، حکومەتەکانی بەجیهانیکردن‌و دامەزراوە داراییە جیهانیەکان هاندراون کە کۆمەکی دارایی بەو دەوڵەتانە بکەن کە پشتگیریی لەو بڕیارانە دەکەن[1].

بۆ جێبەجێکردنی نەخشەکانیان‌و لەناوبردنی خێزان‌و قەوارەی کۆمەڵگای ئیسلامیی لە ڕێگای ئافرەتەوە, لەبەر گرنگی رۆڵی لە بنیاتنانی قەوارەی خێزان‌و کۆمەڵگا, لە چەند ڕێگایەکەوە هەوڵیانداوە مەسەلەی ئافرەت بەو بوارەدا بشکێننەوە کە لەگەڵ ئامانجەکانیاندا وێکدێتەوە لەو ڕێگایانەش: کۆمەککردنی ئەمریکا بۆ کۆمەڵە ئەهلیە ئافرەتە نائیسلامییەکان لە پێناوی جێبەجێکردنی نەخشەکانیان بۆ ترازانی ئافرەتی موسڵمان لە رەوشتە ئیسلامییەکان.

لە ڕێکەوتننامە نێودەوڵەتییەکانی تایبەت بە پاراستنی مافی مرۆڤو نەهێشتنی شوێنەواری هەموو جۆرە جیاکارییەك دژی ئافرەت, دەوڵەتە ئیسلامییەکانیان ناچار بوون بەرامبەر لێبوردن لە هەندێ لە قەرزەکانیان کە لە سەریانە ئەو ڕێکەوتننامە مۆر بکەن..

ئەگەر ئەو توێژینەوانە بخوێنینەوە کە لەو کۆنگرانەدا خوێنراوەتەوە کە لە وڵاتە ئیسلامیەکاندا بەستراون، دەبینین لە هەموویاندا دەیانەوێ ئافرەتی موسڵمان لە سیستەمی کۆمەلأیەتی ئیسلامیی بترازێنن, کە لەروانگەی فیترەت‌و ئامادەییەکانی‌و ڕێزیەوە بۆ ئافرەت دەڕوانن, هاوکات هەوڵەکانیان خستۆتەگەڕ بۆ هەڵخەڵەتاندنی رای گشتیی‌و ئافرەتی موسڵمان[2].

هەرچی ستەم هەیە رووی کردۆتە ئافرەت، ئەو ڕێکەوتننامانە (گوایا -وەرگێڕ-)ستەمی لەسەر هەڵدەگرێت‌و نەتەوە یەکگرتووەکانیش رزگاری دەکات لە ستەمی کۆمەڵگاکەی‌و ئایینەکەی، بەڵام راستیەکەی ئەوەیە کە دەیانەوێ ئافرەت‌و کۆمەڵگاکەش بفەوتێنن[3].

مامۆستا سوهەیلە زەینەلعابدین حەماد، بڕیارەکانی کۆنگرەی پەککین کە فراوانترین کۆنگرە بوو بۆ کورت کردووینەوە, بەڕاشکاوی بڕیارگەلێکی زۆر پڕمەترسی تێدا دراوە کە ئەم خاڵانەی لێوەردەگرین:

**یەکەم: لەبواری ئاییندا**

ا- پشتگوێ خستنی ئایین‌و بەها رەوشتیە مرۆڤایەتییەکان, ئەگەر ناوی ئایینیش برا ئەوە لە چوارچێوەی کەلەپورو نەریتی ئافرەتانی هەژاردا ناوی دەبرێت.

ب- زیاتر لە راسپاردەیەك هاتووە لەسەر هەڵوەشاندنەوەی سڵکردنەوە لەو رەفتارانەی کە بناغەکەیان ئایینی یا شارستانییە, بەڵکو ئایین دووردەخرێتەوەو هەوڵدەدرێت بۆ جیاکردنەوەی لە کاروباری ژیان.

ح- ئەو بەڵگەنامەیە رۆڵی ئایین لە بواری بەرگری لە توندوتیژیی دژی ئافرەت‌و دەستدرێژیکردنە سەری‌و بەزۆر بازرگانیکردن بە ئافرەتەوەو شوێنی رووتی‌و بەرەڵایی پشتگوێ دەخات.

**دووەم: لە بواری خێزاندا**

ا- دانانی خێزان‌و دایکایەتی‌و هاوسەرگیریی بە هۆکاری ستەمکردن لە ئافرەت، داواکردن بۆ دابەشکردنی کاروباری ناومالْ و چاودێری مندالْ لە نێوان پیاوو ئافرەتداوەکو یەك.

ب- پشتگوێ خستنی رۆڵی هاوسەرو دایك لە ناو ماڵدا, ئەو رۆڵە بە ناخۆش و بێزراو دانراوە چونکە کارێکە کرێی نییە.

ح- لەناو بەڵگەنامەکەدا وشەی هاوسەرگیریی نەهاتووە، پەیوەندی سێکسی پەیوەندییە لە نێوان دوو لایەندا کە هەریەکەیان سەربەخۆیی سێکسی خۆی هەیە، مافی مندالْبوونیش مافێکە دراوە بە تاکەکان‌و هاوسەرداران وەکویەك, ئەو خزمەتانەش لەو بوارەدا پێشکەشدەکرێت, پێشکەش دەکرێت بە تاك‌و بە هاوسەردار. داوێن پیسیی (زینا) ناشیرین

---

[1] مجلة المجتمع الكويتية، عدد ١٤٠٦، ٢٥ ربيع الاول ١٤٢١.

[2] انظر تفاصيل هذه المؤامرة العالمية في المراء المسلمة وتحديات العولمة، مجلة المنهل، عدد ٥٦٢، ص٨٤-٨٧.

[3] المصدر نفسه، ص ٨٧-٨٨.

نییە بە بەڵگەی ئەوەی کە دەبێ یارمەتی کچە عازەبی سکپڕ بدرێت کە خوێندن تەواو بکات.

د- ئەو بەڵگەنامەیە ناوهێنانی خێزانی سروشتیی (ژن و پیاو) بەوەی کە هۆکاری بنەڕەتی یەکێتی کۆمەڵگای ئیسلامییە پشتگوێ خستبوو, بەڵکو بە پێچەوانەوە بەڵگەنامەکە داندەنێت بە رەفتارە ناڕەوا(شاز)ەکاندا، ئەو ڕەفتارانەی کە هەڕەشەیە لەسەر رەگەزی مرۆڤ, هەروەها دانی ناوە بە فرەجۆری خێزانداو بانگەوازی بۆ دەکات, مەبەستیشیان (شذوذ)ە, هەروەها بەڵگەنامەکە هانی پەیوەندییە سێکسیە ناشەرعیەکان دەدات.

هـ- ئافرەت لە هەموو تەمەنەکاندا ئازادیی رەهای هەیە کە جۆری رەگەزی خۆی دیاری بکاتو پەیوەندیشی هەبێت لەگەڵ هە رکەسێکدا کە بیەوێت، جا لە چوارچێوەی خێزاندا بێت یا لە دەرەوەی خێزان. هاوکات لەگەڵ دەستگرتنی تەواو بەسەر پرۆسەی منداڵبووندا.

و- هەر پەیوەندیەکی سێکسی کە ئارەزووی ئافرەتەکەی لەگەڵدا نەبێت، ئەگەر لەلایەن مێردەکەشیەوە بێت بە دەستدرێژی دادەنرێت, لەشفرۆشیش هەڵە نییە, تەنها لەو کاتەدا نەبێت کە بسەپێنرێت بەسەر ئافرەتەکەدا.

ز- هەموو جۆرەکانی ئسولیەتی ئایینی کۆسپە لە رێی مافە مرۆییەکانی ئافرەتدا.

ح- پێویستە ئەوەندە توانا بدرێت بە ئافرەت، ئەوەی کە رۆشنبیریی و ئایین و پێشینە تەقلیدییەکان بۆی دیاری دەکەن خۆی دیاری بکات.

ت- پێویستە لەسەر حکومەتەکان و دامەزراوە ئایینیەکان و کەرتە کۆمەڵایەتییە جیا جیاکان, دان بنێن بە رەوایەتی داواکاریی ئافرەتدا، بۆ ئەوەی رۆڵی چالاکانەی هەبێت لەدیاری کردن و، پێناسەکردنی پێوەرە ئایینی و رۆشنبیرییەکان و هەنگاوی چالاکانە بگرێتەبەر بۆ هاندانی لەسەر ئەوە. واتە ئافرەت بەگوێرەی ئامانجی ئەو بیرۆکانە مافی سەرلەنوێ داڕشتنەوەی ئایینی هەبێت. هەروەها بەندی زۆری تێدایە کە پەیوەندی هەیە بە چۆنێتی جێبەجێکردنی ئەو بڕیارانەوە, بە هێزو لەژێر سایەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا بەسەر ئەو دەوڵەتانەدا دەسەپێنرێت کە بڕیارەکانیان مۆر کردووە[1].

کورتەی قسەش: بەجیهانیکردن بریتییە لە کۆتایی مێژوو, واتە دەستگرتن بەسەر جیهاندا لەلایەن نموونەی سەرمایەداریی ئەمریکاوە. هەروەها بریتییە لە کۆتایی جوگرافیا, ئەمیش بڕینی سنووری وڵاتانە لەلایەن کۆمپانیا فرەڕەگەزەکانەوە. هەروەها بریتیشە لە کۆتایی دەوڵەت لە رێگای جولانەوە لە ژێر سایەی شەرعیەتی نێودەوڵەتییەوە, بۆ دەستێوەردانی راستەوخۆ لە کاروباریاندا. هەروەك چۆن بریتیشە لە کۆتایی پێناس، ئەمیش لەناوبردنی تایبەتمەندییە, بریتیشە لە کۆتایی ئایدۆلۆژیا، ئەمیش لەناوبردنی ئایین و رەوشت و بەها بەرزەکانە[2].

## دژایەتی بەجیهانیکردن

بەجیهانیکردن بەم شێوازە ئابووری و دەسەڵاتی ڕاگەیاندن و ڕۆشنبیرییەوە بەسەر زەویەکی پتەودا تێناپەڕێت, بەڵکو دەکێشێت بەکۆسپی فیترەو پێکهاتەی مرۆڤ لە زمانی جیاجیاو ئاینی جۆراوجۆرو ڕۆشنبیریی هەمەڕەنگ. خوای گەورە لەبارەی ئەو جیاوازیەوە فەرموویەتی: (ولو شاء ربك لجعل الناس امة واحدة ولايزالون مختلفين. إلا من رحم ربك ولذالك خلقهم) هود/١٨.

جۆناتان فریدمان لە وتوویژ دەربارەی بەجیهانیکردن دەڵێت: لێرەدا وریاییدانێکی ئاشکرا هەیە لەسەر پێشێلکردنی جیاوازی ڕۆشنبیریی لە جیهاندا نەك تەنها لە پەراوێزی ئابووری ڕەسمی, بەڵکو لە ئەورووپای رۆژئاوا کە لە کۆتایی پەنجاکان و شەستەکاندا حاڵەتێکی- ئەگەرچی بەلای کەمەوە لە نێوان پۆلێکی هەڵبژاردەی ڕۆشنبیریشدا بێت - مەترسی لە ئەمریکاو زاڵبوونی ڕۆشنبیریی کۆکاکۆلا تیایدا سەروەربوو[3].

---

[1] طوفان العولمة، ص٦٤ .

[2] مايك فيدرسون واخرون: المصدر السابق، ص٩٤ .

[3] مستقبل العولمة، ص٢١ .

خوێندنەوەی مێژووی مرۆڤایەتیی بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە لەسەر ئەوەی کە هەوڵدان بۆ ملکەچکردنی مرۆڤایەتی بۆ یەك ڕێبازو یەك شارستانییەت کارێکی ئەستەمو نەکردەیە, چونکە ئەو هەولآنە کۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتیی لەناوەوە دەتەقێنێتەوەو ناکۆکی دەست پێدەکات، ئەمەش بەپێی ئەم یاسا خواییە بەڕێوەدەچێت (وتلك الايام نداولها بين الناس) العمران/ ١٤٠.

ئەگەرچی بەجیهانیکردن لەم سەردەمە نزیکەدا دەرکەوتووە، بەڵام پێشڕەوانی دژایەتیکردنی لە هەموو جیهاندا سەری هەڵداوە. ئەگەر چی ئەمڕۆ بەهێزو راماڵەر نییە, چونکە کێشەکە هێشتا لەسەرەتادایە.

زاڵبوونی ڕاگەیاندن و ڕۆشنبیریی ئەمریکا لە کەناڵە ئاسمانییەکاندا, هانی وەزیری دادی فەڕەنسا (جاك کوبون )یدا کە بڵێت: ئەنتەرنێت بەو ڕەوشەی ئێستای شێوەیەکی نوێیە لە داگیرکردن و ئیمپریالیزم، ئەگەر لە دژی نەجوڵێین ژیانمان لە مەترسیدایە.

فەڕەنسیەکان کۆکن لەسەر کارکردن بۆ زامنکردنی پاراستنی زمانی فەرەنسایی و ڕۆشنبیریی فەڕەنسایی لە کاریگەریی ئەمریکا[1]. تەنانەت سەرۆکی فەرەنسا جاك شیراك بۆ ئەوەی بورجی ئیڤڵ تەنها بە تەرزی شارستانی فەرەنسایی بمینیتەوە ناڕازی بوو لەسەر دروستبوونی چێشتخانەی ماکدۆناڵد کە ژەمی ئەمریکایی پێشکەش دەکات[2]. هەروەها وەزیری ڕۆشنبیریی فەرەنسا لە کۆبوونەوەی ڕێکخراوی یۆنسکۆ لە مەکسیك هێرشێکی توندی کردە سەر ئەمریکاو وتی: من سەرم سوڕدەمێنێ ئەو دەوڵەتانەی کە تا ئاستێکی زۆر گەلانیان فێری ئازادی کردووەو بانگەوازیان بۆ شۆڕش دژی ملهوڕیی ڕاگەیاندووە, هەر ئەوانەن ئەمڕۆ دەیانەوێت ڕۆشنبیرییەکی گشتگیرو تەنها بسەپێنن بەسەر جیهاندا, پاشان وتی: ئەوە جۆرێکە لە جۆرەکانی ئیمپریالیزمی دارایی و فکریی خاك داگیرناکات بەڵکو ویژدانەکان و پڕۆگرامەکانی بیرکردنەوەو جیاوازییەکانی جۆری ژیان داگیردەکات[3].

پێ بەپێی ئەو سیاسەتە فەڕەنسا بڕیاریدا کە ڕێژەی فیلمەکان کە دەخرێنە ڕوو بەزمانی فەڕەنسایی لە تەلەفزیۆنی فەڕەنسادا لە ٦٠٪ بێت[4].

هەروەها نەرویژ بەرامبەر ڕێکەوتننامەی (ماستریخت) نەیار بوو، چونکە تواندنەوە لەپێناسی ئەوروپییدا ڕەتدەکاتەوە, سەنغافورەش خۆی دەپارێزێت لە تۆڕی ئەنتەرنێت لە ترسی بەهای کونفۆشیوسیەت[5].

لە هەرێمەکانی کەنەداشدا دەسەڵاتی ئەمریکا لە بواری لێشاوی بەرنامەکانی ڕاگەیاندن و تەلەفزیۆن گەیشتە ئاستێك کۆمەڵێك لە شارەزایان بانگەوازیان کرد کە وریا بن چونکە منداڵانی کەنەدا وایان لێهاتووە لەبەر زۆر بینینی بەرنامەی ئەمریکایی لە تەلەفیزیۆنەکاندا نازانن خەڵکی کەنەدان[6].

جۆن کرای لە کتێبەکەیدا (سپێدەی درۆزن, خەیاڵەکانی سەرمایەداریی جیهانیی ) دەڵێت: بارودۆخی ئێستای جیهان چاوەڕێی کارەساتێکی گەورەی لێدەکرێت, چونکە لەوانەیە سەپاندنی بازاڕی ئازادی ئەنگلۆسەکسۆنیی بەسەر جیهاندا ببێتە هۆی داڕوخانێکی هاوشێوەی داڕوخانی کۆمۆنیستی جیهانیی. ئاڕاستەکردن بەرەو سەپاندنی بازاڕی ئازاد جەنگ دەتەقێنێتەوە ناکۆکیە ڕەگەزیەکان قوڵدەکاتەوە ملیۆنەها خەڵك هەژار دەخات. هەر ئێستاش ملیۆنەها جوتیاری چینی بوون بە پەناهەندە. هەروەها دەشبێتە هۆی دوورخستنەوەی لە دەوڵەتە پێشکەوتووەکانیشدا. لەمەوپێش بارودۆخ لە هەندێ لە دەوڵەتە کۆمۆنیستەکانی ڕابوردوو تێکچوو تا گەیشتە ئاژاوەیەکی گشتیی و بڵاوبوونەوەی تاوانکاریی ڕێکخراو, هەروەها بووە هۆی زیاتر وێرانکردنی ژینگە[7]. هەروەها کتێبی (فخ العولمة )ی

[1] الدكتور عمر الحاجي: العولمة امام عالمية الشريعة الاسلامية، دار المكتبي، دمشق ١٤٢٠، ص٥١.

[2] المصدر نفسه، ص٥٠ .

[3] العولمة والكيان و الهوية، ص٤٦ .

[4] مستقبل العولمة، ص٢١ .

[5] العولمة والكيان و الهوية، ص٤٦ .

[6] العولمة بين القبول والرفض، المستقبل العربي، عدد ٢٥٦ في حزيران ٢٠٠٠ ، ص١٠٦ .

[7] مسألة العولمة، ص٤ – ٥.

ناوبراو هاوارێکە لە ئەڵمانیاوە لە دژی بەجیهانیکردن.

بول هیرستوگراهام تومسون بەجیهانیکردن بە ئەفسانە دادەنێن لەبەر ئەم هۆیانە:

١- کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان, بنەمایەکی نەتەوەییان هەیەو لەسەر ئاستی نەتەوەگەلی دیاریکراو بازرگانی دەکەن, لەراستیدا ماوە نادەن بە گەشەسەندنی کۆمپانیا جیهانییەکان.

٢- جووڵەی سەرمایە لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا نابێتە هۆی ئاڵوگۆڕێکی گەورە لە وەبەرهێنانو کارمەندیی (العمالة) لە وڵاتە پێگەشتووەکاندا بەڵکو دەبێتە هۆی چڕبوونەوەی وەبەرهێنانی دەرەکیی ڕاستەوخۆ لە ناوەندی ئابوورییە پێشکەوتووەکان، جیهانی سێیەمیش جگە لە کەمایەتیەکی کەم لە وڵاتە پیشەسازییە نوێکان هەر لە پەراوێزی وەبەرهێنانو بازرگانیی دەمێننەوە.

٣- ئابووری جیهان لە ڕاستیدا دوورە لە ئابوورییەکی گەردوونی. بەڵکو بازرگانیو وەبەرهێنانو لێشاوی دارایی لە سێگۆشەی ئەورووپاو یابانو ئەمریکای باکوور چڕبۆتەوە. واشدەردەکەوێت کە ئەم دەسەڵاتە ئامادەیە بۆوەبەرهێنان[1].

کاتێك کۆنگرەی سێیەمی ڕێکخراوی بازرگانی جیهانیی لە سیاتل بەسترا, بەشدارانی کۆنگرە دژی تەنیایی ئەمریکا لە سەرۆکایەتیکردنی جیهان ڕاپەڕین, بەوپێیەی ئەمریکا بنکەی فەرماندەیە بۆ دەرچوونی بڕیارەکان لە چوارچێوەی ڕێکخراوی بازرگانیی جیهانیی، دەوڵەتانی تازە پێگەیشتوو دەوڵەتانی یەکێتیی ئەورووپاو یابانو کۆریای باشوور سووربوون لەسەر ڕەتکردنەوەی ملکەچبوون بۆ خواستی ئەمریکا[2].

ئەوخۆپیشاندانەش کە لە کاتی کۆنگرەکەدا ڕوویدا هەموو جیهانی هەژاند، دروشمی خۆپیشاندەرانیش بریتی بوو لە:

- جیهان نابێت بە شمەك تا بەهێزەکان ئاڵوگۆڕی بکەن.
- خەڵکیو گەلان لەپێش قازانجەوەن.
- بازرگانی ئازادمان ناوێت, بەڵکو بازرگانیەکی دادگەرمان دەوێت[3].

زۆر لە بیریارانی پسپۆڕ لەبواری ئابووریو شتی تردا زۆر بە توندی نەیارن لەگەڵ ملهوڕی بەجیهانیکردندا. توێژەر (سەنا عەبدوڵڵا) ئەو نەیاریانەی لەم خاڵانەی خوارەوەدا کورت کردۆتەوە:

١- دەسەڵاتی ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی کە زیاترە لە دەسەڵاتی دەوڵەت لەگەڵ پێداویستییەکانی سەروەری نیشتمانیدا ناگونجێت. ئەوەش کاردەکاتە سەر توانای دەوڵەتان لە داڕشتنی ئەو یاساو ڕێسایانەی کە لەگەڵ نەخشەو ئاراستەکانیدا دەگونجێت.

٢- تۆمەتبارکردنی کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان بە چەوساندنەوەی هێزی کار لە دەوڵەتە تازە پێگەیشتووەکاندا لە ڕێگای کارپێکردنیان بە کرێی کەم.

٣- نارەزایی لە کردنەوەی بازاڕی ئەمریکایی لەبەر ئەوەی دەبێتە هۆی هاتنە ناوەوەی داهاتگەلێك دوور لە مواسەفاتی ژینگەو تەندروستی ساغ.

٤- نارەزایی لە کارپێکردنی منداڵ.

٥- کۆمەڵانی پارێزەری ژینگە ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی بە وێرانکردنی ژینگە تاوانبار دەکەن[4].

لەم چوارچێوەیەشدا, دەبێت ئەو راستیە بوترێت: سەرمایەداریی کە بەجیهانیکردن پشتی پێدەبەستێت لە هەموو وڵاتێکدا یەك بەرنامە نییە. سەرمایەداریی ئەمریکاو بەریتانیا هیچ ڕۆڵێك بۆ دەوڵەت نابینێ, بەڵام سەرمایەداریی یابانو ئاسیا سیاسەتی پیشەسازی ئاراستەکانی دەوڵەت ڕۆڵێکی گەورەی تێدا دەبینێت. بەڵام سەرمایەداریی فەڕەنسا نەخشەی دەوڵەتو ئامارەی تایبەت دادەنێت بۆ کەرتی تایبەت. سەرمایەداریی دەوڵەتە شۆسیال دیموکراتەکان

[1] ثناء عبدالله: المصدر السابق، ص٩٥.

[2] محمود ابو الفضل: منتدى دافوس والعولمة والعالم بعد سياتل، جريدة الحياة.

[3] ثناء عبدالله: المصدر السابق، ص١٠١.

[4] احمد عبدالغفور: المصدر السابق، ص٧٢.

هێزەکانی کۆدەکاتەوەو بیرۆکەی نوێ دەهێنێ بۆ دژایەتی سەرمایەداریی و کەمکردنەوەی خراپەکاریەکانی[1]. نووسەرانی (مستقبل العولمة) دەڵێن: لەگەڵ ئەوەی کە جێگای ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ئابووری جیهانیدا ڕەها نییەو ئابووری جیهانیش فرە جەمسەرە، بەڵام چوارچێوەی سیاسیی و ئاسایشیی نێودەوڵەتی یەك جەمسەرە، ئەوەش وایکردووە لە ئەوروپاییی و یابانیەکان لە بەجیهانیکردن دەترسن و خۆیان ئامادە دەکەن بۆ مامەڵە لەگەڵیا[2]. بەڵکو ئەو ترسە بۆ کۆڕی وتووێژی شارستانییەتەکان لە قاهیرە گوازرایەوەو لە ڕاپۆرتی کۆتایدا هاتووە: فکری ئەمریکا سەرکردایەتی شارستانییەتی ئەمڕۆ دەکات و هەڵدەستێت بە خاڵیکردنەوەی لە هۆش و هەست. ڕۆژئاوا هەوڵ دەدات خۆی وەکو تاکە شارستانییەت سەقامگیر بکات فرە جۆریی ڕۆشنبیریی دادەڕنێت و وەکو ئەزمونێکی جیهانیی بۆ ئەزموونەکانی دەڕوانێت[3].

گومانیی تێدانییە کە هۆی سەرەکی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەم دکتاتۆریەتە نێو دەوڵەتییە، دژی بەرژەوەندی زۆربەی زۆری دەوڵەتانی جیهانە، لەناویشیاندا دەوڵەتە گەورەو مامناوەندیەکان، لێرەوە بۆ ڕزگاربوون لەو دکتاتۆریەتە هەستان بەکاری دژ بەوە فەرز دەبێت[4].

مرۆڤایەتی وردەوردە لەبەر ڕۆشنایی یاسای جووڵەی گەردوونیی، یاسای بەربەرەکانیی و قبوڵکردن (التحدي والاستجابة)، یاسای جیاوازیی و ناکۆکی (الاختلاف والصراع)، بەرگری لە بەجیهانیکردن بە شێوازی ئەمریکایی سەرمایەداریی زایۆنی دەکات. ڕوسیا بە ڕەهەندی زمان و ئایین و کەللەڕەقی قەیسەریەتیی و یادەوەریەکانی سۆڤێت و توانا ویرانکاریەکانی، چین بە قوڵایی کۆنفۆشیۆسی، هیند بە پێشینیە بوزیەکانی، یابان بە بەرژەوەندییە ئابووریە گەورەکانی و یادەوەریەکانی میللەتەکەی لەگەڵ هێرۆشیماو ناکازاکی، ئەڵمانیا بە فەلسەفە ڕەگەزایەتیەکەی کە تا ئێستاش لە نەستیاندا ماوەتەوە، کاردەکەن بۆ ئەوەی بەجیهانیکردن بەسەرکردایەتی ئەمریکا نەگات بە ئامانجە کۆتاییە تاکڕەویەکانی لە جیهاندا[5]. هەر بەو شێوەیەش جیهانی ئیسلامیی، بیروباوەڕی ئیسلام و پێشینە شارستانیەتەکەی پشت بەخوا لە خەو ڕایدەپەڕێنێ و بێداری دەکاتەوەو هانی دەدات بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ بەجیهانیکردندا لە ڕوانگەی دیدێکی گشتگیرو هاوسەنگی میانڕەویەوە لە نێوان هەردوو ئاراستەی ماددیی و بەها ڕەوشتییەکاندا. نموونەی ئەوەش مالیزیا لە ڕێکەوتننامەی بازرگانی جیهانیی پاشەکشەی کردو لەمپەری خۆپارێزی بۆ سەقامگیرکردنی دراوەکەی لە داڕوخان دانا.

پاشان چل و نۆ کەسایەتی بانقیی لە شوێنەواری بەجیهانیکردن لەسەر جیهانی ئیسلام لێکۆڵینەوەیان ئەنجامدا، لە دانیشتنی بیست و چوارهەمی بەڕێوبەرانی پرۆسەکان و وەبەرهێنان لە بانقە ئیسلامییەکاندا، هەموو کۆکبوون لەسەر مەترسی بەجیهانیکردن لەسەر داهاتووی جیهانی ئیسلامیی و داوایان لە بانقە ئیسلامییەکان کرد لەناو خۆیاندا هاوپەیمانی پێکبهێنن. هەروەها کۆمپانیا پیشەسازییە کشتوکاڵییە داراییەکان لە بواری پەرەپێدانی ئابووریدا کاردەکەن بۆ بەدەستهێنانی بەرگریی و هێز بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی بەجیهانیکردنی هاتوو[6].

بە هەمان شێوە گەلانی جیهان، ئەوەی مێژوو شارستانییەتیان هەیە، ناکرێ بگۆڕێن بۆ مردووی بەردەستی مردووشۆرانی بەجیهانیکردنی ئەمریکای زایۆنی، سەموئیل هینتگتۆن خاوەنی کتێبی (پێکدادانی شارستانیەتەکان)یش دان بەوەدا دەنێت کە ئەو کتێبە لە بنەڕەتدا لێکۆڵینەوەیەك بوو لە ساڵی ١٩٩٦ لە گۆڤاری (کاروباری دەرەوە)دا بە ناونیشانی ( ڕۆژئاوا تەنهایەو جیهانی نییە) بڵاوی کردبووەوە، کە تێیدا دەڵێت: جیهانی ناڕۆژئاوایی ناتوانن بچنە پێکهاتەی شارستانیەتی ڕۆژئاواوە، با کەلوپەل و شمەکی ڕۆژئاوایی بەکاربەرن و سەیری فلیمی ئەمریکاییش بکەن و گوێ لە مۆسیقای

---

[1] مستقبل العولمة، ص١١.

[2] منير شفيق: النظام العالمي الجديد، طبعة الاولى ١٤٢٠، ص١٦.

[3] أحمد مصطفى عمر: المصدر السابق، ص٨٩.

[4] جان ماري جيهتو: امركة العالم ام عولمة العالم، مجلة الثقافة العالمية، يناير ٢٠٠١، ص٢٩.

[5] منار الإسلام، عدد ٣، ربيع الاول ١٤٢٠، ص٣٩ – ٤٠.

[6] الدكتور عبدالعزيز عثمان التويجري: الهوية والعولمة بين المنظور التنوع الثقافي، مجلة لواء الإسلام، عدد ١٥، ص١٦.

رۆژئاواییش بگرن. رۆحی هەر شارستانیەتێك بریتییە لە زمان‌و ئایین‌و بەهاو خوونەریت, شارستانیەتی رۆژئاواش بەوە جیادەبێتەوە کە میراتگری شارستانیەتی یۆنان‌و رۆمان‌و مەسیحیەتی رۆژئاوایە, بنەمای زمانی گەلانی لاتینیە، جیاکردنەوەی ئایین‌و دەوڵەت، سەروەریی یاسا ، فرەیی لە سایەی کۆمەڵگای مەدەنیدا، پەیکەری نوێنەرایەتیەکان ئازادیی تاکە. هەروەها لەسەری دەڕواو دەڵێت: هەرگیز بە نوێبوونەوەو گەشەی ئابووری رۆژئاوایبوونی رۆشنبیریی لە کۆمەڵگا ناڕۆژئاواییەکاندا دروست نابێت, بەڵکو بەپێچەوانەوە دەبنە هۆی زیاتر پابەندبوون بە رۆشنبیریی رەسەنی ئەو گەلانەوە، لەبەر ئەوە کاتی ئەوە هاتووە کە رۆژئاوا وازبێنێت لە خەیاڵی بەجیهانیکردن[1].

---

[1] اعلام العولمة، ص٧٥.

# بەشی دووەم

## بەجیهانیکردن لە دیدی ئیسلامەوە

### ئایا بەجیهانیکردن ڕەت بکەینەوە؟

بەجیهانیکردن نە فەلسەفەیەکی دیاریکراوەو نە ڕۆشنبیرییەکی تەسکە، نە ڕێبازێکی ئابووری سنووردارەو نە کەناڵێکی تەلەفزیۆنی یەك ئاراستەیە. بەڵکو بەجیهانیکردن –لەدووتوێی ئەوەی باسمان کرد– دیاردەیەکی جیهانیی گەردوونیی گشتگیرەو هەموو گۆی زەوی داپۆشیووە، گەورەترین ڕاستیی واقیعی ئەم سەردەمەی ئێستامانە، لە سایەی شۆڕشێکدا کە گۆی زەوی کردووە بە خڕۆکەیەك لە زانیاریی، کە بە هەموو ئاراستەکاندا دەخولێتەوە[1].

بەجیهانیکردن لە ڕووی سیاسەتی ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و پەروەردەو فێرکردن و ڕۆشنبیریی و ڕاگەیاندن و کەرەستە سەربازیەکانەوە هەموو جیهانی داگیرکردووە.

زیاتر لە پێنج سەد مانگی دەستکرد بە دەوری زەویدا دەخولێنەوە، ئاماژەی بێتەل دەنێرن, بانگەواز بۆ بەجیهانیکردن دەکەن, وێنەکانیان لەیەك دەچێت, بیرۆکەو خەون و هیواو کردەوەکانیان یەکە, بەو کەناڵانە دەوترێ ڕاگەیاندنی بێ نیشتمان لە ئاسمانێکی بێ سنوور[2]. لەبەر ئەوە هەرگیز کەسێکی ژیر ناتوانێ بڵێت ئێمە دەتوانین ئومەتی ئیسلامیی بخەینە قتویەکەوەو سەرەکەی دابخەین[3]. خۆ ئەگەر بشتوانین ئەوە لە بەرژەوەندی خۆمان و نەوەکانی داهاتووشمان نییە، هەروەها لە بەرژەوەندی بنیاتنانی شارستانیەتی ئیسلامیی نوێشمان نییە، لە بەرژەوەندی شارستانیەتی مرۆڤایەتی سەرلێشێواویش نییە, چونکە مرۆڤایەتی چاوەڕێی ڕزگارکەرێکە بەهای بەرزو ڕەوشتی جوان و برایەتی ڕاستەقینەی پێببەخشێت و هەموویان پێکەوە ببەستێت.

ڕاستی کرد ئەوەی وتی: بەڵام ڕەتکردنەوەو بەرگریی لە پێکەوەلکان لەگەڵ جیهانی ئەم سەردەمەدا، کرانەوە بەرامبەری، سوود وەرگرتن لە پێشکەوتنی و گەشەکردنی ئەو حوکمە بەسەر خودداو بەسەر کۆمەڵگاشدا بە دوورکەوتنەوە لە ڕەوڕەوەی ژیانی جیهان و مێژوو, ئەگەرچی ئەوە بە کردار ناکرێت، چونکە ئێمە بمانەوێ و نەمانەوێ دەخزێنرێینە ناو بزاوتی گەردوون.

کێشەکە ڕەتکردنەوە یا پەسەندکردن نییە، کرانەوەو داخران نییە، بەڵکو کێشەی چۆنێتی هاوکاریی و ئالیەتی چوونە ناو ئەو ئەزموونە جیهانییە بە کەمترین زیان و ئامادەیی ماددیی و ئابووریی و فکریی و ڕۆشنبیریی زانستیی. هەروەها کارکردن بۆ گەشەپێدانی بوارە ماددیەکان کە دەتوانرێ لە ڕێگایانەوە کاریگەر بیت و کاریکەیت لە ڕەوڕەوەی جیهانی ئەمڕۆدا. دیارە جگە لە توانامان بۆ نوێبوونەوەو گەشەپێدانی هێزە ئابووریی و سیاسییەکانمان هیچ شتێك زەمانەتی پاراستنی تایبەتمەندییە ڕۆشنبیریی و نەتەوەییەکان ناکات[4].

---

[1] العولمة في المستقبل، مجلة الإسلام اليوم، عدد ١٦–١٧، ص١١.

[2] الدكتور محمد امخزون: المصدر السابق، ص٢١.

[3] مستقبل العولمة، ص٢٦.

[4] سيار الجميل: المصدر السابق، ص٢٢.

کەواتە کێشەکە کێشەی بەجیهانیکردن نییە، بەڵکو کێشەکە کێشەی خراپ وەرگرتن و نەبوونی نەخشەو پلانی هۆشمەندە بەرامبەر بەجیهانیکردن.

یەکێك لە توێژەران دەڵێت: هێندەی مەترسی لە خراپ وەرگرتن و خراپی وەرگرو تەوزیف کردنی ئایدۆلۆژی بەجیهانیکردنە، هێندە مەترسیی لە خودی بەجیهانیکردندا نییە. سەرکەوتنی بەجیهانیکردن لە خۆسەپاندن و چوونە ناوەوەو کاریگەرییە، هێندەی پەیوەندی هەیە بە بەهێزیی و لاوازیی دەوڵەتانی وەرگرەوە، ئەوەندە پەیوەندی نییە بە توانای دەوڵەتە پێشکەوتووە چالاکەکانی هەناردەکەری بەجیهانیکردنەوە[1]. بەڵێ نەتەوە لاوازەکانن کە لە روو بە ڕووبوونەوەی بەجیهانیکردندا زیان دەکەن, هەموو شتێك لەدەست دەدەن, بەڵام نەتەوە بەهێزەکان, ئەوانەی ڕووبەڕوی بەجیهانیکردن دەبنەوەو تێهەڵکێش دەبن, کارلێك دەکەن لە گەڵیا، ئەوانەن کە جەنگی پێشبڕکێی شارستانییەت دەبەنەوە.

مامەڵە لەگەڵ دنیای بەجیهانیکردندا ئەوە ناگەیەنێ کە بەجیهانیکردن قەدەرێکی سەپێنراوەو هەمیشە گرەو دەباتەوە, مانای خۆبەدەستەوەدانی ملکەچانە نییە, بەڵکو دەتوانرێت بۆ رووبەڕووبوونەوەی دەسەڵاتی بەجیهانیکردن مامەڵەی بەهێزو مانای هاوژیانی لەگەڵیداو تەوزیفکردنی رەهەندی تەکنۆلۆژی و شارستانیی و سوود وەرگرتن لێی بەکاربێت.

لێرەدا دەبێ دان بەوەدابنێم کە لە جیهاندا هیچ شارستانییەت و رۆشنبیریی و بەهاو ئایینێك هێندەی ئایینی ئیسلام و جیهانی ئیسلام کاری تێناکرێت.

ئەگەر توێژەرێك بێت و توێژینەوەیەکی ورد لەسەر بەجیهانیکردن بە هەموو رەهەندەکانیەوە بکات، بشڵێ گوایا لەناوبردنی موسڵمانان مەبەستی سەرەکی و کاری گەورەی بەجیهانیکردنی ئەمریکای سەرمایەداریی زایۆنیە، ئەوە بە ڕای زۆر کەس زیادی نەوتووە[2]. ئەگەر جارێکی تر بڕیارەکانی کۆنگرەی ئافرەتانی پەکین بەوردیی بخوێنینەوە، ئەو راستیەمان بە ڕوونی بۆ دەردەکەوێت.

رۆجیە گارودیش بۆ ئەو راستیە دەچێت و دەڵێت: ئەو یەکێتیەی ئەمڕۆ کە لەلایەن فەرمانڕەوایانی ئەمریکاو لۆبی زایۆنیەوە (ئالای باك ALBAC) و سەرۆکانی دەوڵەتی ئیسرائیلەوە دامەزراوە لە راستیدا لەسەر دژایەتیکردنی ئیسلام و ئاسیا دروستکراوە, چونکە گرنگترین دوو کۆسپن لە ڕێگای دەسەڵاتی جیهانیی ئەمریکای زایۆنیەوە[3].

توێژەرێکی تر دەڵێت: ئەوەی لەم هێرشە ڕۆشنبیرییە جەختی لەسەر کراوە موسڵمانەکانن، ئەویش لەبەر دوو هۆ:

١ – ئەو خێرو بێرەی لە وڵاتەکانیاندا هەیە لە کەرەسەی خاوی بێشمار لەسەروو هەموویانەوە نەوت و گازو سامانی سروشتی تر.

٢ – ئەوەی کە بۆ ناوەندەکانی توێژینەوەو زانکۆو رۆژهەڵاتناسەکانیان سەلمێنراوە ئەم ئوممەتە تێك ناشکێت ئەگەر پارێزگاری لە پێناسی ئیسلامیی خۆی بکات. لەبەر ئەوە تاکە ڕێگا لەناوبردنی کەسایەتی و هەڵوەشاندنەوەی ئایینەکەیەتی کە هانی دەدات بۆ شۆڕش و ڕەتکردنەوەی هەموو شێوەیەکی دەسەڵات و داگیرکردن[4].

لێرەدا دوو هۆی تر زیاد دەکەم:

ا – پاراستنی ئاسایشی قەوارەی زایۆنی داگیرکەر لە ناوجەرگەی جیهانی ئیسلامدا گرنگترین ئامانجی بەجیهانیکردنە لە وڵاتانی ئیسلامییدا.

ب – چونکە شارستانیەتی ئیسلام بە بیروڕاو ئایین و سیستمی ڕەوشتیی و دەسکەوتە ماددیەکانی, تاکە هەڵوەشێنەری گشتگیریی فەلسەفەی بەجیهانیکردن و ئایین و سیستم و بەها بێئابڕووە نزمەکانیەتی لە دنیادا.

[1] المصدر نفسه، ص٢١٤ .

[2] العولمة، ص٢٤٢.

[3] الدكتور محمد امخزون : المصدر السابق، ص١٢٦–١٢٧.

[4] منير شفيق: المصدر االسابق، ص١٨–٢٢.

## بەجیهانیکردن دەتوانێ چی بە موسڵمانان بکات؟

یەکەم: بەجیهانیکردن راستەوخۆ پشتی بەستووە بە شارستانیەتی رۆژئاوایی هاوچەرخ، کە بنەما مرۆڤکردە دوور لە ئایینەکان ئاراستەی دەکەن، ئەو شارستانیەتەی نە باوەڕی بە خوا هەیەو نە پرسیاری لێدەکات, نە باوەڕی بە بیروڕا ئایینیەکان هەیە لە باوەڕ بە پێغەمبەرایەتی بە گشتیو پێغەمبەرایەتی محەمەد ع بە تایبەتی, هەروەها بڕوای نییە بە رۆژی قیامەتو شتە نادیارە جێگیرەکان کە دەقی یەکلاکەرەوەی لە قورئانو سوننەت لەسەر هاتووە.

بەگوێرەی ئەوە ژیانی ماددیو خوانەناسیی لە رێگای تۆڕە گەردوونیەکانەوە بە شێوازی ئەوپەڕی هەڵخەڵەتێنەرو کاریگەر لەسەر دەروونی مرۆڤو بزواندنی ئارەزووەکانی، راستەوخۆو ناڕاستەوخۆ کار دەکاتە سەر سەدان ملیۆن لە موسڵمانان، ئەمەش دەبێتە هۆی رەتکردنەوەو گومان پەیداکردنو گوێنەدان بە بیروباوەڕ، واتە قەوارەی مرۆڤی موسڵمان وندەکات، عەقڵو رۆحو دەروونی خاڵیی دەکاتەوە لە بنەما ئیمانییەکان.

دووەم: جۆرە سیستمێکی دیموکراسی پێشکەش دەکات کەویستی مرۆڤ دەشێوێنێو عەقڵی لێدەسێنێتەوە, داوای پشتگوێخستن یا رەتکردنەوەی خواو ئایین دەکات, لە روانگەی ئەوەشەوە رێزی مرۆڤ نامێنێو خودێتی لەدەست دەدات، ئەمەش لە رێگای هەڵخەڵەتاندنی ئاگاداریەکانو(اعلانات), کە رۆژانە دەوروبەری گرتووەو دەوری ژیانە هیلاکەکەی داوە بەڕێوەدەچێت، یان بەو ئاراستەدا دەیبات کە دەیانەوێت. واتە: ئەم دیموکراتیە سەرمایەدارییە ئەمریکاییە زایۆنییە، هەڵدەستێ بە هەڵخەڵەتاندنی مرۆڤ کە لەسایەیدا ئیرادەی لەدەست داوە. بەڵگەشمان بۆ ئەمە، فەرمانڕەوایان لە ئەمریکا هەمیشە نمایندەی ئەو سەرمایەدارییە چاوچنۆکەن کە ئاراستەی ئەو دیموکراسیەتە دەکات.

سێیەم: دامودەزگای بەجیهانیکردنی گەردوونیی کە دەورەی جیهانی داوەو لە هەموو ساتێکدا بێ پرس خۆی دەخزێنێتە هەموو ماڵەکانی سەرڕووی زەوی، گەمە بە قەوارەی هەموو تاکەکان دەکات، ئارەزووی سێکسی لە جەستەیاندا دەوروژێنێ, لەشپەرستی دەرازێنێتەوە, هەموو جۆرە لادانێك بڵاودەکاتەوە، بەها بەرزە سروشتیەکانی مرۆڤ دەروخێنێ, بەوەش لەگەڵ ئەو سیستمە کۆمەڵایەتییو رەوشتییە ناگونجێت کە ئیسلام خوازیاریەتیو لە سایەیدا خێزانی ئیمانداری پاكو بێگەرد دروست دەکات.

چوارەم: ئەو هێرشە خوانەناسیە بێ ئابڕوییە (اباحي)ی کە گەمە بە مرۆییێتی بەرز دەکاتو رێنمایی رۆڵەکانی دەکات بەرەو ئاژەڵیو دوور لە بەرپرسیارێتی، تۆوی نائومێدیو سەرسوڕمان لە دەروونی رۆڵەکانیدا دەچێنێو رۆحی لە هەموو هیواو چالاکیەك خاڵی دەکاتەوە, بەمەش گەورەترین زیان لە موسڵمانان دەداتو دەیانگۆڕێت لە نەوەیەکی تێکۆشەرەوە, کە بێ ئومێد نابێت لە رەحمی خوا، بۆ نەوەیەکی خاڵی لە هەموو ویستو وئیرادەیەكو قاڵبوو بە ئارەزووی دەروونی لەوپەڕی ئاژەڵێتیداو هەموو ئامانجە بەرزەکانی لە دەست دەدات.

پێنجەم: ئەو پلانە دۆزەخیە ترسناکە، کەسێتی موسڵمان هەڵدەوەشێنێتەوە، دەیانکاتە پاشکۆی خەڵکی تر، رەسەنایەتییان لێدەسێنێتەوە، وایان لێدەکات خوازیاری بەرزێتیو بنیاتنانی شارستانیەتی ئیسلامیی مرۆڤایەتیی گشتگیری هاوسەنگ نەبن, تا بە هۆیەوە خۆیان لە داڕوخان رزگار بکەنو رێنمایی خەڵکی تریش بکەن بۆ رزگاربوون لە ژیانی ئاژەڵێتی.

شەشەم: بەجیهانیکردنی ئەمریکایی تەنها بە پارچەپارچەیی موسڵمانەکان رازی نابێت، بەڵکو هەوڵ دەدات هەر وڵاتێکیشیان بکات بە چەند پارچەیەکەوە, بۆ ئەوەی بە خۆیانەوە خەریکیان بکاتو بە تەواوی ئەوەیان لەبیر بەرێتەوە کە هەموویان یەك ئوممەتن کە ئوممەتی ئیسلامییە.

حەوتەم: ئا لەم بارودۆخەدا موسڵمانان لە خەوی بێئاگاییان رانابەڕن، بەرژەوەندی ماددی خۆیان داین ناکەن، بەڵکو دەست لە سەروەتو سامانیو وڵاتەکانیان هەڵدەگرن، بۆ ئەوەی کۆمپانیا سەرمایەدارییە چاوچنۆکەکانی بەجیهانیکردن بەتاڵان بیبەن بۆ خۆیان، لەناو موسڵمانانیشدا هەژاریو بێکاریی تەشەنە بکات، نەخۆشی کۆمەڵایەتیو تاوانکاریی

لەناویاندا بڵاوببێتەوە، کە ژیانیان لە داماویەوە بەرەو سەرشۆریش ببات, لە کاتێکا ئیسلام هێزو یەکێتیو سەربەرزیو بەفیڕۆنەدانی سامانو بەرژەوەندییان دەخوازێت.

هەشتەم: بەجیهانیکردن پلان دەگێڕێت بۆ دەستێوەردانی سەربازیو راگەیاندنی جەنگ لە هەر قوژبنێکی دنیادا کە بیەوێت لە دەسەڵاتی ئەوان دەربچێت، چونکە دەیانەوێت جیهان لە ژێر چنگی ملهوڕیی ئەمریکاو یاسای ئەمریکاو هێزی سەربازی ئەمریکادا بێت. ئەمەش دوو راپۆرتی مەترسیداری زۆر نهێنی ئاشکرای دەکەن کە راپۆرتەکانی (جریمیا)و (لڤۆڤیتز)ن[1].

گومانی تێدا نییە، پشکی جیهانی ئیسلام لە سایەی ئەو سیاسەتە ستەمکارەدا زۆر گەورە دەبێت, بە تایبەتی لە کاتێکا لە دوای داڕمانی بلۆکی رۆژهەڵات، رۆژئاوا بەدوای دوژمنێکدا دەگەڕا، هیچی نەدۆزیەوە جگە لە دوژمنە دێرینە تەقلیدیەکەی کە (ئیسلامە)، ئێستاش ئیسلام وا بە دنیا دەیناسێنێ کە مەترسیەکە هەڕەشە لە بەرژەوەندیی رۆژئاواو جیهان دەکات، ئەوەی کە ناتوانێ بە هیچ جۆرێك دەسەڵاتی رۆژئاوا بلەرزێنێ.

کتێبی (کۆتایی مێژوو)ی فۆکۆیاماو (پێکدادانی شارستانیەتەکان)ی هینتگتۆن, باشترین بەڵگەن لەسەر راگەیاندنی ئاشکرای دوژمنایەتیکردنی ئیسلامو دانانی بە دژێکی مەترسیداری بەها شارستانیەکانی رۆژئاوا[2].

نۆیەم: لەسایەی بەجیهانیکردندا پارچە پارچەیی دەوڵەتە ئیسلامییەکانو دەستوەشاندن لە دەرامەتە ستراتیژیەکانی جیهانی ئیسلام، وەکو پەترۆڵو شتی تر زیادی کردووە.

## رەوشمان بەرامبەر بەم کارەساتە

ناتوانین بەم بارودۆخەی ئێستامانەوە کە جیهانی ئیسلامیی پێدا تێدەپەڕێت، بۆ کەمکردنەوەی زیانەکانی بەجیهانیکردنو راوەستان بەرامبەری بجوڵێین، ئەویش لەبەر ئەم هۆیانە:

– ئێمە بە قۆناغی لاوازی ئیماندا تێدەپەڕین، شارەزانین لە بیروباوەڕی راستەقینەی ئیسلام, لە ڕووی مەزهەب و تایەفەو رەگەزەوە پارچە پارچەین، عەقڵیەتی بێهۆکاریی(اللاسببية)و پاڵدانەوە زاڵبووە بەسەرماندا, چونکە تا ئێستا لەگەڵ بوونی هەموو هۆکارەکانی پارچە پارچەییمان لەو مێژووەدا دەژین کە باوو باپیرانمان درووستیان کردووە، بۆ ئەوەی بماندات بەدەست پارچە پارچەییەکی نوێوە.

– بێئاگابوون لە خستنەگەڕی سوننەتەکانی خوا لە بوونەوەرو ژیاندا, بەڵکو لێیان تێنەگەیشتین، چونکە لە قورئانو سوننەت تێنەگەیشتووین، ئەوەی بووە هۆی دواکەوتنی شارستانیەتمان کە لە بازنەی ململانێو تووێژ کردینیە دەرەوەو رۆژئاوا پێشمان کەوتنو وڵاتەکانیان داگیر کردین، نەوەکانمانی بە پرۆگرامی دانلوب لە رێگای خۆی ترازاند[3], بنەمای بێدینی لەناودا بڵاوکردینەوە، ئەوەش کێشەیەکی گەورەی لەناو رۆشنبیرانماندا بڵاوکردەوە لەبارەی ئاینو ئوممەتەکەیانەوە[4].

– ئەوەمان لەبیرچووە کە خوا پەروەردگاری جیهانیانە, نەك تەنها موسڵمانان وا گومانمان برد کە تەنها موسڵمان بوونمان بەسە بۆ ئەوەی بەڵێنی سەرکەوتنمان لەلایەن خواوە بێتەدی, لەکاتێکا خوای گەورە فەرموویەتی: (ان تنصروا الله ينصركم ويثبت اقدامكم) واتە: ئەگەر گوێڕایەڵی خوابنو فەرمانەکانی جێبەجێ بکەن خوا سەرتان دەخات. ئایا ئێمە گوێڕایەڵیی فەرمانەکانی خوا بووین؟

– پابەند نەبووین بە مەزنترین شەریعەتەوە کە خوا بۆی داناوین, کە ژیانمان رێکدەخات, پەروەردەی نەوەکانمان دەکات، ئوممەتەکەمان یەکدەخات، راستیەکانی ژیانمان تێدەگەێنی, ئاشتیو ئارامی لە دڵو دەروونو لە کۆمەڵگاکەشماندا جێگیر دەکات. نەوەیەکمان بۆ درووست دەکات کە بە هەموو ئاراستەکانی ژیاندا ببزوێت، ئامانجی

---

[1] محمد فهيم يوسف: حقوق الانسان في ضوء التجليات السياسية للعولمة، مجلة البيان، عدد ١٣٢، ديسمبر ١٩٩٩، ص١٠٨.

[2] ندوة الاقتصاد الإسلامي، مجلة البيان، عدد ١٥٢، ص٧٠.

[3] دانلوب: قەشەیەك بوو ئینگلیزەکان لە نێوان ساڵانی (١٨٩٩ – ١٩١٩) هێنایان بۆ میسر تا سیستمی پەروەردەی میسر دابڕێژێت.

[4] راجع كتابنا : ازمة المثقفين تجاه الإسلام في عصر الحديث.

بنیاتنانو گۆڕانکارییو نوێکردنەوە بێت.

کاتێ ئیمانمان لاواز بوو، پابەندبوونمان کەمبوویەوە، ڕەوشتە بەرزو بەها بالاکانمان داڕمان، ڕەفتارمان تێکچو، کەمتەرخەمیو دووڕوویيو خۆپەرستی لەناوماندا تەشەنەی سەند. پێشەوای چاکمان لەدەستدا، نەوەکانمان بە شێوەیەك پەروەردە نەکرد کە چاو لە پێغەمبەری خواو ﷺ خزمانیو هاوەڵەکانیو زانا چالاکەکانو بانگخوازە ڕاستگۆکان بکەن, هەربۆیە نەوەکانمان لایاندا بۆ چاولێکەرییو لاسایی کردنەوەی هەڵگرانی شارستانی ماددی بێ پەردەی ڕۆژئاوایی. نەوەیەکی دەست بەتاڵو بێ بەرهەمو, دوور لە هەموو داهێنانێکیان هێنایەکایەوە, ئارەزووەکانی خۆی دەپەرست، هەمیشە لە ژیانی ڕابواردنو کۆڕو کۆمەڵی دوور لە هەموو پیاوەتیو کەرامەتێك دەژیا.

– بە مەبەستی گەشەپێدانێکی شارستانییو کۆمەڵایەتیی گشتگیر سوودمان لە دەرامەتو توانا ماددیو مەعنەویو سامانە زۆرو جیاجیاکانی ئیسلام وەرنەگرت, تا بتوانین بەوە بەربەرەکانی پلانە جیهانیەکان بکەین لە دژمانو کەسێتی خۆمان بپارێزین.

– لە پێویستیەکانی ژیانماندا، پشتمان بەستووە بە دوژمنەکانمان، چ لەچەكو تەکنۆلۆژیا، چ لە خواردنو داوودەرمانو ڕێکخستنی کاروباریشدا, تا بە پاشکۆیەتی ئەوان بمێنینەوەو هەمیشە لە پەراوێزی پیشەسازیی بێکەڵکدا بژین.

– زیاتر لە (٨٠٠) ملیار دۆلار زیادەمان لە بانقەکانی ڕۆژئاوادایە، کەچی قەرزی ناڕەواو بە سووی زۆر لەوان دەخوازین، ئەوەش ڕێگرە لە پەرەپێدان, چونکە ئەو سووەی دەیدەین زۆر لە خودی قەرزەکە زۆرترە.

– زۆربەی حکومەتەکانمان بە هۆی پرۆگرامی دوور لە ئایینی (عەلمانییەوە) بێ ڕێسایەك یا تێگەیشتنی تەواو لە ئاراستە یا ناوەرۆکی بەجیهانیکردن بە سیاسەتی ئابووریی ڕۆژئاواوە بەستراوەتەوە، بێ سەرنجدان لەوەی ئاخۆ لەگەڵ پەرەپێدانی ڕاستەقینەدا دەگونجێت کە کۆمەڵگاکانمان پێویستی پێیەتی. ئینجا ئەگەر دەستپێکەکان ڕاست نەبوون، ئەوا ئەنجامەکانیش ڕاست دەرناچن.

– نەمانتوانیوە بۆ ڕزگاربوون لە دیاردەی دکتاتۆریەت دامەزراوگەلی شورایی درووست بکەین ، کە لە دوای جەنگی (صفین)ەوە لەولاتەکانماندا چێنراوە، جیاواز لەوەی کە ئیسلام بۆی هێناوین، کە حوکمڕانییە لەسەر بنەمای شورا. بۆ ئەوەی ئوممەتەکەمان ژیانی خۆی لەسەر ببنیات بنێ, بڕیار لەسەر کێشە مەترسیدارەکان بدات کە پەیوەستە بە داهاتوویەوە.

ئا لەمەوە هەمیشە لە مێژووماندا حوکمڕانەکانمان بەپێی ئارەزووو بەرژەوەندیو بۆچوونەکانیان ئاراستەی ژیانیان کردووین, ، بە تایبەتی حوکمڕانەکانی موسڵمانان لە سەردەمی نوێدا, ئەوانەی بە ناکۆکیو ملهوڕیو تاکڕەوییان هەموو هەلێکی مێژوویيان لەدەست گەلانیاندا, دوژمنیان بە ژیانو کەرامەتو نیشتمانەکانمان خۆشکرد, بە تایبەتی زایۆنزمە ملهوڕەکان کە بە قۆستنەوەی ئەوواقیعە دڵتەزێنە سەرزەوی فەلەستینیان داگیرکرد، لەبەر ئەوە ڕاستی کرد ئەوەی وتی: سیاسەت بە گشتی شادەماری ژیانی کۆمەڵایەتی عەرەبە, لە هەمان کاتیشدا لە گشت جولانەوە کۆمەڵایەتییەکاندا ناوەندی داڕمانە[1].

– نەزانییو برسێتیو نەخۆشی ئوممەتەکەمانی هاڕیوە، ئەویش لە ئەنجامی پلانە ستەمکارەکان کە لە کۆمەڵگا ئیسلامییەکاندا پیادەکرا, پەژارەی گەورەی ئیسلام ئەوەبوو کە ڕۆڵەکانی چینی هاڕاو والێبکات بە ژیانێکی بەختەوەر بژین کە مرۆێتیو ڕێزیان بپارێزێت. ئەوەش لای هەموو ئەو کەسانە ئاشکرایە کە یاساکانی ئیسلامیی بۆ لەناوبردنی هەژارییو نەخوێندەوارییو نەخۆشی خوێندبێتەوە.

– نەمانتوانیوە بیرۆکراتیەتو ڕۆتینو گاڵتەکردن بە کات لە ژیانماندا لەناو ببەین، لەبەر ئەوە تێکڕای بێکاریی زیادی کردووە, نەمانتوانیوە پەرەبدەین بە سامانەکانمان، بۆیە کەوتووینە ژێر باری گرانی قەرزاریی دامەزراوە

[1] ندوة الاقتصاد الإسلامي، مجلة البيان، عدد ١٥٢، ص ٧٠ – ٧١.

داراییەکانی بەجیهانیکردنەوە[1].

ئەنجانی بەجیهانیکردن و ریشە کۆنەکانی جگە لە لایەنەکانی تر لە ژیانی ئابووریماندا زۆر مەترسیدارە، هەندێ لە ئابووریناسان لەم خاڵانەدا کۆی دەکەنەوە:

١ – کۆتایهێنان بە رۆڵی کەرتی گشتییو دوورخستنەوەی دەوڵەت لە ئیدارەی ئابووری نیشتمانیی .

٢ – بەجیهانیکردنی یەکە ئابووریەکانو کردنیان بە پاشکۆی بازاڕی جیهانیی، بۆ ئەوەی ئیدارەکردنی ببێتە ناوەندییو لە هەندەرانەوە ببرێت بەڕێوە.

٣ – کارکردن بۆ خۆخزاندنە ناو بازاڕی عەرەبی لەلایەن بازاڕی بیانیەوە .

٤– بەڕێوەبردنی ئابوورییە نیشتمانییەکان بە گوێرەی دیاریکراوەکانی بازاڕی نێودەوڵەتی دوور لە پێداویستیی گەشەپێدانی نیشتمانی.

٥ – کارکردن بۆ دووبارە پەیکەرسازیی ناوچەی عەرەبی لە روانگەی (تکتلات)ە نێودەوڵەتییەکانەوە[2].

بەجیهانیکردن دیاردەیەکی کاتی نییە، کێشەیەکی دیاریکراویش نییە، بەڵکو پلانێکی جیهانی گەورەیە دژی مرۆڤایەتی، دەوڵەتی بەهێزو سامانی بێشومارو شارەزایی زانستییو تەکنۆلۆژیای بەرزو نەخشەگەلی زیرەکانە بۆ کۆنترۆڵکردنێکی مەترسیداری جیهان لە پشتیەوە راوەستاوە .

ئەگەر حاڵ ئاوابێت، ئێمە ناتوانین خۆمان بپارێزینو لە مەوقیعێکی بەهێزو سەربەخۆو زیرەکانە مامەڵەی لەگەڵدا بکەین, مەگەر ژیانمان بگۆڕین لە روانگەی ئەم ئایەتەوە: (ان الله لايغير ما بقوم حتى يغبروا ما بانفسهم) الرعد/١٠، تا شوێن ئەم راستیانە نەکەوین گۆڕینی ژیانیشمان ناکرێت.

## چۆن ژیانمان بگۆڕین بۆ رووبەڕووبوونەوەی بەجیهانیکردن؟

١ – ئیسلام وەکو ئاینێکی تەواوو کاملو گشتگیر دابەزیە سەر دڵی پێغەمبەرع, رووبەڕووی نەفامییە جیهانییەکان بوویەوە، مرۆڤپەرستیی گۆڕیی بۆ پەرستنی خوای تاکو تەنها، تەنگایی دنیای گۆڕی بۆ فراوانی دنیاو قیامەت، لە ستەمی ئایینەکانەوە بۆ دادگەریی ئیسلام، کۆمەڵگایەکی مرۆڤایەتی خواپەرستی زانای دادگەری پێکهێنا، هاوبەش بۆ خوا دانانو ئەفسانەگەرییو بێهۆکارییو نائەقلانیی لە کۆمەڵگادا نەهێشت.

سیستمی کۆمەڵگاکەی ئەو شەریعەتە بوو کە فەرمان دەکات بە چاکەو دادگەرییو چاکەکارییو خزمایەتی، بەرگریشی کردووە لە بەدڕەفتارییو خراپەو ستەم, ئەمە بوو بە هۆی گەورەترین گەشەپێدانی شارستانی لە کۆمەڵگادا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا[3]، قوتابخانەو زانکۆو نەخۆشخانەی زۆریان کردەوە، دادگاکانیان بە دادگەرانە حوکمیان دەکرد, هەموو مرۆڤێکی موسڵمان دەیزانی کە پشکی خۆی هەیە لە ناوە پیرۆزەکانی خوا، خۆی پیوە بەستبوو، دەروونی خۆی پەروەردە کردبوو، ژیانی لە نێوان ئەو پشکانەدا هاوسەنگ بوو, کە بوو بە هۆی بڵاوبوونەوەی بەها ئیسلامییە بەرزەکان کە لە بازنەی ئیسلامو ئایینەکانو هەموو مرۆڤایەتییدا دەجولا, ئیسلام گۆڕانکارییەکی گشتگیری لە ژیانی مرۆڤدا کرد, ژیانی زنجیرەیەك لە بزووتنەوەو جیهاد بوو لە هەموو بوارەکانی ژیاندا.

ئیسلام هەر لە چینەوە هەتا ئەندەلوس, لە ئاسیای ناوەڕاستەوە بۆ باشووری ئەفریقا بڵاوبۆتەوە. خوای گەورە بەو ئیسلامە چاوگەلێکی نابینای روونکردەوە، گوێگەلێکی نابیسای والاکردەوە, دڵگەلێکی داخراوی کردەوە, چەندەها کۆمەڵگاو دەوڵەتی پێکهێنا, چەندەها سەرکەوتنی بەسەر ملهوڕانو ستەمکارانو دەستدرێژکاراندا بەدەستهێنا, لە سایەیدا چەندەها نەوە پەروەردە کرا کە مردنی لە رێگای خوادا لە ژیان پێخۆشتر بوو, هەوەکو چۆن هاوبەشدانەران ژیانیان لە رێگای شەیتاندا خۆشدەویست.

---

[1] العرب والعولمة، مستقبل العربي، ص٦٨ .

[2] الاقتصاد العربي في مواجهة تحديات النصف الثاني من عقد السبعينات، مجلة آفاق عربية، ١/٢/١٩٩٥، ص٢.

[3] راجع كتابنا : الإسلام والتنمية الاجتماعية.

ئیسلام ئوممەتێکی یەکگرتووی تەبای دروستکرد کە رەگەزنامەی یەکەمیان ئیسلام بوو, جیاوازی نەتەوایەتییو زمانو نیشتمان لە ناویاندا تواوبوویەوە.پاشان ئەو لاوازی ئیمانەی کە پێشتر باسمان کرد لەم سەدەیەی دواییدا تووشی موسڵمانان بوو, ئەمڕۆش ئێمە رووبەڕووی مەترسی بەجیهانیکردن بە قورسایییو پلانەکانیەوە دەبینەوە.

– ئایا چ شتێك سەرلەنوێ گەرمایی ئیمانمان بۆ دەگێڕێتەوە ؟

– چی دەمانکاتەوە بە ئوممەتێکی تەباو برا؟

– چی گەلانی ئیسلامیی دەکاتەوە بەیەك؟

– چی پابەندمان دەکاتەوە بە بەها بەرزە هاوبەشەکان؟

– چی رەسەنایەتی ئوممەتەکەمانو شارستانییەتەکەمان دەسەلمێنیٚ؟

ئەوەی بەدوای راستیدا بگەڕێت دەڵێت: ئەوە تەنها ئیسلامە, ئەو ئایینە نەمرە بە بیروباوەڕە پوختەکەیەوە, بە شەریعەتە فراوانە سنگفراوانەکەیەوە, بە بەها بەرزو مرۆڤایەتییە پێگەیشتووەکەیەوە, بە ئەزموونە مێژووییە بەناوبانگەکەیەوە, بە پیاوە مەزنە ناودارەکانیەوە. ئیسلام ئەو گەنجینە مەزنەیە کە تەنها ئەو دەتوانیٚ ژیان بگێڕێتەوە بۆ ئەو جەستەیەی کە نابزوێ, بۆ ئەو عەقڵەی بیرناکاتەوە, بۆ ئەو دڵەی لێنادات.

زیاتر لە سەدەیەکە ئێمە بە مەبەستو نەخشە بۆکێشانەوە لێی دوور دەکەوینەوە, چ بە کاریگەری دەرەکی یا کاریگەری ناوخۆیی بێت, ناوخۆیی وەکو شیاویمان بۆ داڕمان, دەرەکییش وەکو هێرشی بەگاورکەرانو رۆژهەلاٚتناسانو بەرۆژئاوایکردنو ئیمپریالیزم.

ئێستا گەڕانەوەمان بۆ ئیسلامەکەمانو دەستپێك لێیەوە، بۆ ئەم سەردەمەمان پێویستە پیاچوونەوەی ئەم خالاٚنە بکەین:

### فکری ئیسلامیی:

– دەبێ جەخت لەسەر ئەوە بکەینەوە کە بنەما نەگۆڕەکانی عەقیدە لە قورئانو سوننەت لە لقەکانی(فروع) جیا بکەینەوە، واتە: پابەندبوون بە بنەماکانەوەووازهێنان لەو لقانەی کە زانایان جیاوازن لەسەری، بۆ ئەوەی سەرلەنوێ پارچە پارچە نەبینەوەو نەوەکانمان بەشێوەیەك پەروەردە بکەین کە گونجاوبن لە بیروباوەڕدا.

– زۆر رەوتی فکریی ئیسلام لە کۆندا رەوتی (اجتهاد)ی بوون، روبەڕوی فەلسەفەو رەوتە فکریەکانی سەردەمی خۆیان بوونەوە، جارێك پێکاویانە، جاری واش هەبووە نەیانپێکاوە، جاریش هەبووە بەهەڵەدا چوون. ئەمڕۆش لە بەرژەوەندیمان نییە زیندویان بکەینەوەو ناکۆکیەکی نوێ لەناوماندا زیندوو بکەینەوە.

– بە شێوازێکی نوێ روبەڕوی بیرۆکە نوێکان ببینەوەو لە بابەتێکی زانیاری نوێوەو لە قورئانو سوننەوە دەست پێبکەین.

– پێڕەوێکی گشتگیر بۆ تێگەیشتنی ئیسلام بگرینەبەر کە عەقیدەو شەریعەتو رەفتارو جوڵەو بنیاتنانی شارستانیەت لە رێگای پێڕەوێکی عەقڵیی ساغو بیرکردنەوەیەکی زانستی رێکوپێك, کە باوەڕی بە پێشکەوتن هەبێت لە رێگای یاسای هۆکارو ئامانجەوە.

– باوەڕمان بەوە هەبێت کە فقهی ئیسلام فقهێکە نوێ دەبێتەوە، لە ئاستی سەردەمێکی دیاریکراودا راناوەستیٚ, مەزهەبێکی دیاریکراو نییە, لە دووتوێی ئامانجەکانی شەرعو رێسای ئاسانکاریی روبەڕوی گرفتەکانی سەردەم دەبێتەوە.

– توێژینەوەی سوننەتە گەردوونیەکان بکرێت بە شێوەیەکی زانستیانەی بابەتیو سوود وەرگرتن لێی بۆ چوونە ناو سەردەمی شارستانی ئیسلامیی نوێوە.

– بەگژاچوونەوەی هێرشی رۆشنبیریی ئەمریکایی زایۆنی لە رێگای پرۆگرامی پێشووی فکریی ئیسلامییەوە بە هەموو ئەو کەرەسانەی کە پشتی پیٚ دەبەستیٚ, بە هەموو جۆرەکانی فکرو ئەدەبو هونەرەوە کە بەجیهانیکاران لە بیرۆکە دژ بە ئیسلامەکانیاندا دەری دەبڕن.

– مامۆستا مونیر شەفیق دەڵێت: پێویستە لەم سەردەمەماندا بەرپەرچی رۆشنبیریی بە رۆشنبیریی، شیعر بە شیعر, چیرۆك بە چیرۆك, زانست بە زانست, شانۆگەریی بە شانۆگەریی, تەلەفزیۆن بە تەلەفزیۆن بدەینەوە, ئەو هەوڵەش با تەنها بەرپەرچدانەوە نەبێت, بەڵکو بوارێك بێت بۆ داهێنانی راستەقینە بەپێی ئەو مەرجانەی ئەو بوارە پێویستیەتی, بۆ ئەوەی ببێتە بەشێك لە جەنگی شارستانیی گەورەتر[1].

هەروەها دەڵێت: ئەگەر ئوممەتەکەمان رووبە رووی داگیرکردن بۆتەوە لە بوارەکانی چەمك و فکرو رۆشنبیریی, ئەوا زۆر پێویستە بۆ راوەستان بەرامبەر ئەو گەلەکۆمە پڕمەترسیە بەرەی رۆشنبیریی و هونەریی و راگەیاندن بکاتەوە، هەروەها بۆ دژایەتی مامڵەکردن لەگەڵیا لە ژێر سایەی رێکەوتن و هاوکاریکردنیدا. پێویستە بەرەی رۆشنبیریی بکرێتەوە دژ بە بەهاکانی ئەمریکاو پێوەرەکانی، کە سەرەڕای ویستی دوورخستنەوەی بەهاکانی ئیسلام و سەربەخۆیی نیشتمانی و بەهای خێزانی و رەوشتی لێمان دەیەوێت پێناسی ئیسلامیشمان بسڕێتەوە[2].

**فکری سیاسیی:**

پێویستە هەستین بە هەڵسەنگاندنێکی مێژوویی گشتگیر یۆ سیستەمی حوکمڕانیی لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا لە دوای جەنگی (صفین)ەوە تا ئەمڕۆ، چونکە تاکڕەوی لە حوکمڕانیداو ملهوڕی تێدا باوبووە لە مێژوومان‌دا* چ لە دەوڵەتی ئومەویدا یا عەباسیدا، یا عوسمانی یا دەوڵەتەکانی ئەندەلوس و هیتریش کە بە درێژایی چەند سەدە حوکمڕانیی جیهانی ئیسلامییان کردووە. هەروەها لە دەوڵەتە نوێکانی ئەم سەردەمەدا بە جیاوازی سیستەمە عەلمانییەکانیان، یا بەقسەی خۆیان ئیسلامیان جێبەجێ کردووە بەڵام بە شێوەیەکی شێوێنراو, بە پچڕ پچڕی قورئان و سوننەتیان جێبەجێ کردووە. ئەو سیستەمە دکتاتۆریانە جیاوازن لە سیستەمی شورای ئیسلامی کە پێغەمبەرﷺ خەلیفەکانی راشدین پیادەیان کردووە، ئەوەی کە دەتوانرێت لەم سەردەمەدا بە ئالیەت و کەرەسەی نوێ و گونجاو لەگەڵ رۆحی ئیسلامدا پیادەی بکەیت. هەر ئەوەشە رێز بۆ مرۆڤی موسڵمان دابین دەکات، مافی نەیاریکردن و رادەربڕینی بەوپەڕی ئازادییەوە بۆ دەگێڕێتەوە[3].

تا باوەڕ بە شورا نەبێتە جێبەجێکردنێکی گشتگیرو بچێتە ناوواقیعی کۆمەڵگای ئیسلامییەوە، کێشەی حوکمڕانیی هەر دەمێنێتەوە، زیانەکانیشی لە سەر هەموو ئاستەکان بەردەوام دەبێت، هەروەها تا حوکمڕانە نوێکان لە رێگای داڕشتنی یاساگەلی ناڕەواوە کە جگە لە بەرژەوەندی خۆیان و پاراستنی کورسیەکانیان هیچ ناگەیەنێت لە ئازاردانی نەیارەکانیان بەردەوام بن و مافی رادەربڕینیان لێ زەوت بکەن, ئازارو ئەشکەنجەیان بدەن, بیانکوژن, ئەوا ئوممەتەکەمان لە بازنەیەکی بۆشدا دەخولێتەوەو لە بنیاتنانی شارستانیەتی داهاتوویدا بەشداری ناکات.

تا کاتی نووسینی ئەم وشانە، سیستەمی سیاسی لە کۆمەڵگای ئیسلامییدا، سیستەمێکی ملهوڕی تاکڕەوی دکتاتۆرەو تەنها لە بەرژەوەندی سەرکردەکانی بەجیهانیکردن و دوژمنانی ئەم ئوممەتەیە، ناکۆکی و پێکدادان لە نێوان گەلان و فەرمانڕەواکانیاندا تەنها لە بەرژەوەندی ئەوانە, لەبەر ئەوە دەبینین بەجیهانیکردن یارمەتیدەرە بۆ مانەوەی سیستەمە ستەمکارەکانی جیهانی ئیسلام, لە کاتێکا ئەوان بانگەواز بۆ دیموکراتی و ئازادی لە دنیادا دەکەن.

هەموو ژیرەکان کۆکن لەسەر ئەوەی، هەرچی کارەسات لەم سەدەیەدا بەسەر ئیسلام و موسڵماناندا هاتووە، تەنها لە ئەنجامی راستەوخۆی ناکۆکی نێوان حاکمەکان لەناو خۆیانداو تاکڕەویان لەبیروڕاداو دژایەتی کردنیان بووە بۆ خاوەن بیروڕا شیاوەکان, هەروەها نەبیستنی قسەی راست و نەگەڕانەوەیان بۆ پێوەرەکانی ئیسلام لە رووی بیروباوەڕو شەریعەت و رەوشتەوە، جگە لەوەی زۆریان پەیوەندیان هەبووە بە دوژمنانی ئوممەت و ئایینەکەیانەوە.

زۆربەی حاکمەکانی موسڵمانان. لەم سەدەی دواییدا، بوون بەهۆی جیاوازییەکی زۆر لەناو موسڵماناندا, هەرگیز

---

[1] النظام العالمي الجديد، ص٧٨ .

[2] المصدر نفسه، ص٧٨ .

* نووسەر لێرەدا زیادەرۆیی کردووە, چونکە فەرمانڕەوایانی ئیسلام لەو سەردەمانەدا تاك تاكێکیان ستەمکاربوون, نەك بەگشتیی. وەرگێڕ.

[3] راجع كتابنا : حق المعارضة السياسية في المجتمع الإسلامي.

ئوممەتیان بۆ تێکۆشان‌و جوڵەو گۆڕانکارییو بنیاتنان ئامادە نەکردووە, سامانی موسڵمانانیان بۆ دروستکردنی کۆشک‌و تەلارو لە پێناوی ئارەزووە چەپەڵەکانیان بەفیڕۆ داوە, بەوپەڕی ژیانی دەستبلاوییەوە ژیاون, یان خەرجیان کردووە بۆ جەنگە دۆڕاوەکانیان کە نەنەخشەیان بۆ کێشابوو، نەویستی ئەو جەنگەشیان هەبووە.

ئەنجامی ئەو سیاسەتە لاروڵەوێرە تاوانکارە, بوو بەهۆی داگیرکردنی فەلەستین لەلایەن زایۆنییەکانەوە، هەر ئەوەشە ئەمڕۆ دەبێتە هۆی ملهوڕیی بەجیهانیکردن بەسەرماندداو بەسەر هەموو جیهانیشدا.

من لەگەڵ زۆر لەوانەی لەسەر ئەم بۆچوونەن, جەخت لەسەر ئەوە دەکەمەوە کە هیچ چاکسازییەك ناکرێت لەوڵاتەکانماندا، ئەگەر لەسەر بنەما راستەکانی خۆی نەکرێت، سروشتی سیستمی سیاسیی لەوڵاتەکاندا لە دکتاتۆریەتەوە نەگۆڕێت بۆ شورا؟ لە زەوتکردنی بیروڕاکانەوە بۆ ئازادیی بیروڕا, لە کپکردنەوە بۆ نەیاریی کردن, لە بەرژەوەندیی تاکەکەسەوە بۆ بەرژەوەندیی گشتیی, لە حوکمی تاکڕەوەوە بۆ حوکمی دامەزراوە دەستورییەکان.

هەر ئەمەشە نهێنی بەپەرۆشیی ئەمریکاو جولەکەی جیهانییو ئەوانەی لە گەڵیاندان, بۆ مانەوەی رەوشی سیاسیی لە جیهانی ئیسلامدا لەسەر هەمان شێوەی خۆی. چونکە ئەوە ئاسایش بۆ ئەوان دەهێنێ‌و بێدەنگیی لەسەر تاوانەکانیان لە جیهانی ئیسلامییدا دروست دەکات.

### فکری ئابووریی:

ئابووریناسە ئیسلامییەکان، سیستمی ئابووری ئیسلامیی هاوچەرخیان لە قورئان‌و سوننەو سەردەمی خەلیفەکانی راشدین هەڵگۆزیوە, هەروەها لە ئیجتهادی زانایان لە سەردەمە یەك لە دوای یەکەکاندا, ئەوەشیان بۆ زیاد کردووە کە لە کێشە ئابووریەکانی سەردەمدا سەری هەڵداوەو لەگەڵ رۆحی ئیسلامدا دەگونجێت. دەتوانم ئەوەش بڵێم کە ئاراستەی ئیسلامیی لە بنیاتنانی ئابووریدایە کە ئوممەتی ئیسلام رزگار دەکات لە ناڕێکی ئابووری‌و جیاوازیی ستەمکارانەی دابەشکردنی سامانەکانی لەناوبرد, هاوسەنگیی بۆ کۆمەڵگای ئیسلامیی گێڕایەوە, رۆڵی دەوڵەتیشی لە ئابووریدا لە دووتوێی ئەو هاوسەنگیەوە دیاریکرد. ئایا بۆچی؟

– چونکە ئابووری ئیسلام ئابووریەکی نەرمە, یەك رێگەچارە بۆ هەموو کات‌و شوێنێك دانانێت, بەڵکو بنەماکانی بڕیارداوەو ئازادیی جوڵەی بۆ چارەسەری گرفتە ئابووریەکان بەپێی بارودۆخە جیاوازەکان بە ئابووریناسان داوە.

– بۆ چارەسەری خراپ دابەشکردنی سامانەکان‌و رێگرتن لە دروست بوونی کۆمەڵگای ستەمکار رێگریی لە چەوساندنەوەو تالان‌و بڕۆ کردووە.

– خاوەنداریێتی رەوایە، بەڵام کۆمەڵێك مەرجی بۆ داناوە هەتا رێبگریێ لە خراپ بەکارهێنانی مافی خاوەنداریێتی، هەروەها شانبەشانی خاوەنداریێتی تایبەتی، خاوەنداریێتی گشتی‌و خاوەنداریێتی دەوڵەتیشی داناوە.

– دەبێ کەفالەتکردنی(التکافل) کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا هەبێت, چونکە ئەوە دەگات بە هاوسەنگیی.

– رەخساندنی هەلی یەکسان بۆ هەمووان‌و, پەکنەخستنی وزە مرۆییەکان.

– زاڵبوونی ئاراستەی کۆمەڵیی (الجماعي) لە ئابووری ئیسلامدا، بۆ زاڵکردنی بەرژەوەندیی زۆرینەی زەحمەتکێش‌و لایەنگیریی تەواوی چەوساوان‌و هەژاران.

– حەرامکردنی کۆکردنەوەو نەخستنەکاری سامان, بەڵکو دەبێت سامان بخرێتە کار بۆ ئەوەی وەزیفەی کۆمەڵایەتی خۆی ئەنجام بدات.

– هەر کاتێ دەوڵەت بە پێویستی زانیی بۆ ژیانی هاووڵاتییان مافی دەستێوەردانی لە ژیانی ئابووری هەیە.

– کار پێوەری سەرەکییە, ئەمەش لە بیرۆکەی جێنشینایەتیەوە(الاستخلاف) سەریهەڵداوە, کۆمەڵگاش بەرپرسیارە لە دۆزینەوەی کار بۆ هەموو بێکارێك.

– پاراستنی سەرمایەو پەرەپێدانی‌و بەفیڕۆنەدانی, لەبەر ئەوە ئیسلام بنەمای دەستگرتن بەسەر سامانی گێلە پیاوی بڕیارداوە.

– لەسایەی ئابووری ئیسلامدا دەرامەتەکان بەسن, چونکە ئابووری قەناعەتە نەك دەستبلاوی‌و بەفیڕۆدان.

– لە روانگەی ئەم رێسا شەرعیەوە (لە هەرکوێیەك بەرژەوەندی خەڵکی هەبوو, ئەوە شەرعی خوا لەوێیە) هەر سیستمێکی ئابووری هاوچەرخ، کە سامان زیاد دەکاتو ئامانجەکانی ئیسلام دەهێنێتەدی لە بەختیارکردنی خەڵکیی، ئەوە لە ئابووری ئیسلامە،.

– پێویستە هەموو چالاکییە مرۆییەکان بۆ بەدیهێنانی پەرەپێدانی ئابووری گشتگیر بخرێنەگەڕ.

– پشتنەبەستن بە خەرجیپێدانی(التمويل) بیانیی, چونکە سەربەخۆیی بڕیار لەدەست دەدات, ئەوەی کە لە خوارووی خۆرهەڵاتی ئاسیا روویدا, وانەیەکی زۆر گەورەیە بۆ هەموو موسڵمانان.

ئەمە هەندێ لە هێڵە سەرەکیەکانی ئابووری ئیسلام بوو، کە جیاوازە لە سیستمە ئابوورییە ناسراوەکانی ئەم سەردەمە, بێگومان هەرکاتێ پیادەکرا, رێگاو شێوازی سێیەم بۆ پەرەپێدان لە کۆمەڵگادا سەر هەڵدەدات, چونکە رێگایەکە مەبەستی تەنها قازانج یا کیفایەتی ئابووری نییە،، بەڵکو رێگای بەرهەمهێنانێکی ئابووری رەوشتیی مرۆڤایەتییە, پێویستییە گرنگەکانی مرۆڤەکان دابین دەکات, لەگەڵ بەشێك لە تەواوکاریەکانیشی(الكماليات) ئەگەر لە تواناداهەبوو[1].

ئابووریناسی فەرەنسایی (جاك ئۆسترۆی) دەڵێت: رێگای پەرەپێدانی ئابووری تەنها لەو دوو رێبازە ئابوورییە ناسراوەدا, سەرمایەداریو سۆشیالیستی قۆرخ نەکراوە, بەڵکو رێبازێکی ئابووری سێیەمیش هەیە کە پەسەندترە, ئەویش رێبازی ئابووری ئیسلامە. هەروەها دەڵێت: ئەو رێبازە لە داهاتوودا جیهان دەگرێتەوە, چونکە شێوازێکی کاملی ژیانە[2].

ئەگەر موسڵمانان لە رێبازی ئابووری ئیسلامەوە بناوان هەڵبگرن, کە لقێکە لە رێبازی گشتیی ئیسلام بۆ کاروباری بونەوەرو خواو کۆمەڵگاو مرۆڤ, سودیش لە توانا ئابوورییە گەورەو جیاجیاکانی موسڵمانان وەربگرن، بەهێزیش بن لە ئەنجامدانی لایەنی کانزاکانو کشتوکاڵەوە[3]. بە بەجیهانێتی ئیسلامیو خۆرهەڵاتیی رووبە ڕووی بەجیهانیکردنی ناوەندیی زایۆنی بوونەوە، مامەڵەشیانکرد لەگەڵ ئابووری جیهانیدا لە رێگای ئاڵوگۆڕی بەرژەوەندی، خۆشیان بە سوودوەرگرتن لە رێکخستنەکانی شارستانی رۆژئاواو نەخشەیان بۆ پەرەپێدان کێشا, هەستان بە دروستکردنی بازاڕێکی ئیسلامیی هاوبەش, هەروەها سامانە گەورەکانیان کە لەولاتە رۆژئاواییەکاندایە بگوازنەوە بۆ جیهانی ئیسلام، ئەمیش پاش گەڕانەوەی متمانەو برایەتی لەناو ئوممەتەکەماندا, ئەوکاتە ئا لەو بارودۆخەدا دەتوانن زۆر لە مەترسییەکانی بەجیهانیکردن لەسەر خۆیان کەم بکەنەوە، چونکە بەجیهانیکردن وەکو گورگێك وایە تەنها مەڕی دوورەپەرێزو تاك دەخوات.

### فکری کۆمەلایەتیی:

کاتێ باس لە سیستمی کۆمەلایەتیی ئیسلام دەکەین, دەبێ جەخت لەسەر ئەم خالانە بکەینەوە:

١– کۆمەڵگای ئیسلامیی بە تێکۆشانی پیاوو ئافرەت بنیات دەنرێت, هەندێکیان هەندێکی تریان تەواو دەکەن, ناشکرێت لایەك بخرێتە شوێنی لایەکی ترەوە چونکە بەوە هاوسەنگیی تێکدەچێت.

٢– هیچ جیاوازیەك لە بناغەی دروست بووندا نییە, بەڵکو هەر لایەك لاکەی تر بە باشتر دەزانێت بۆ ئەو ئەرکەی پێی سپێراوە.

٣– کۆمەڵگای ئیسلامیی لەسەر بنەمای باوەڕ دروست دەبێت, بێ گوێدانە جیاوازیی زمانو رەنگو رەگەز هەموو موسڵمانان پێکەوە کۆدەکاتەوە.

٤– خاوەن ئایینەکانی تر هەموویان وەکو موسڵمان ئەرك و فەرمانیان لەسەرە، مەگەر لایەنە شەرعیەکانی تایبەت بە خۆیان.

---

[1] الإسلام والتنمية الاجتماعية، ص٥٥.

[2] الدكتور محمد احمد العسال وفتحي عبدالكريم: النظام الإقتصادي الإسلامي مبادؤه واهدافه، الطبعة الثانية، قاهرة ١٩٩٧، ص١٣–١٤.

[3] العولمة، مستقبل العربي، ص٦٦ –٦٧ .

٥- لە چوارچێوەی کۆمەڵگای ئیسلامییدا، مرۆڤەکان هەموو ڕێزیان پارێزراوە.

٦- کۆمەڵگای ئیسلامیی لەسەر بناغەی بەها ئیسلامییەکانو بەها مرۆڤایەتییە گشتییەکان کە هەموو لەسەری کۆبوونەتەوە بنیاتنراوە.

٧- دەبێ دادگەریی بۆ کۆمەڵگا دابین بکرێت, لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا هیچ جیاوازیەك لە نێوان موسڵمانو ناموسڵماندا نییە.

٨- بۆ دەرخستنی تواناو لێهاتوویی بۆ بنیاتنانی کۆمەڵگایەکی شارستانی هەلی یەکسان بۆ هەمووان دابین دەکرێت.

**کێشەی ئافرەت:**

ئیسلام لە شەریعەتە مرۆڤایەتییەکەیدا، سەربەخۆیی کەسێتی ئافرەتی بڕیارداوە, بە شیاوی ئاییندارىو پەرستنی داناوە، وەکو پیاو مافی دەنگدانی داوەتیۆ لە هەموو چالاکییە کۆمەڵایەتییەکاندا لە چوارچێوەیەکی ڕەوشتیدا بەشداری کردووە, مافی کارکردنی داوەتیٚ ئەوەی لەگەڵ سروشتیدا دەگونجێت, مافی میراتی داوەتیٚ, هاوبەشە لە ئیدارەکردنی خێزانو پەروەردەی منداڵدا.

کردوویەتی بە ئەرکی سەرشانی پیاو کە چاکەکاربێت لەگەڵیاو ڕێزی مرۆێتی بگرێت, لە سەرپەرشتی سامانو گرێبەندا لەگەڵ پیاودا یەکسانی کردووە, مافی کەسێتی دادوەریی سەربەخۆی داوەتیٚ[1].

کەواتە پێویستە ئافرەت لەسەردەمی دواکەوتوویىو نەفامیو خراپ تەئویل کردنی یاسا ئیسلامییەکانی تایبەت بە ئافرەت تێپەڕێنین، دەبێت بە تەواوی دانبنێین بەوەی کە نیوەی کۆمەڵن, دەبێت لە ڕوانگەی حوکمە شەرعیە گشتیەکانی ئیسلامەوە پیاچوونەوە بۆ کێشە کۆمەڵایەتییەکانی بکرێت, هەوڵی دوورخستنەوەی هەندێ لە (اجتهاد)ی کۆن بکرێت کە تایبەتن بە سەردەمی خۆیان, ئەوەی کە کۆتی داناوە بۆ ئافرەت لە بواری پەروەردەو فێرکردنداو بەشداری کردن لە بوارە جیاجیاکانی ژیاندا, ئەوەی کە دەگونجێت لەگەڵ فیترەو پێکهاتەو بەرژەوەندی کۆمەڵگاکەی بێ شوێنکەوتنی ئارەزووە سووکەکانی، ئەوانەی کە شارستانییەتی ڕۆژئاوا پێی گەیشتوون.

هەروەها بۆ ئەوەی بتوانین بەرانبەر بە بەجیهانیکردنی بێپەردەییو بەرەڵایی(اباحی) ڕاوەستین, کە دەیەوێت ژیانی خێزان بگۆڕێت, بە تایبەتی ئافرەت, دەبێ وڵاتە ئیسلامییەکان پیاچوونەوەی یاساکانی باری شارستانی لە چوارچێوەی ڕێبازە ڕاستەکانی ئیسلامدا بکەن، یاسای نوێی بۆ دابڕێژن کە پشت بەستووبێت بە فقهی بەراوردکاریی, نەك فقهی تاك مەزهەب, بۆ ئەوەی ئافرەت بە تایبەتیو خێزان بە گشتیی ڕزگار بکەین لە کێشە کۆمەڵایەتییەکانی، بۆ ئەوەی خێزانێکی ئیسلامیانەی بەهێزی سەقامگیر دابمەزرێنین، ڕێگا بگرین لەوانەی مەلە لە ئاوی بەجیهانیکردندا دەکەن، چ کافرو چ موسڵمانە دوور لە ئایینەکان[2].

**فکری پەروەردەیی:**

بۆ وەستان بەرامبەر هێرشی کەناڵە ئاسمانیەکانی بەجیهانیکردنو پلاندانانی زانستییو فکریی زیرەکانەیان, لە دووتوێی زنجیرە تەلەفزیۆنیەکانو فلیمەکانو ڕێنماییو ڕاپۆرتەکانیانو خستنەڕووی فکریان بە شێوازی جیاجیاو کاریگەر, کە ڕۆژانە لە ڕێگای ملیۆنەها دەزگای تەلەفزیۆنو رادیۆو ئەنتەرنێتەوە بڵاودەبێتەوە, ناتوانرێ پارێزگاریی لە خودو ڕەسەنایەتیو تایبەتمەندیی ئایینیو فکریی بکرێت, مەگەر بە پەروەردەی ڕۆڵەکانی میللەتەکان نەبێت بە پەروەردەیەکی نەخشە بۆکێشراو, کە هەستی ئەوەیان تێدا پەیدا بکات کە ڕۆڵەی میللەتانی ئیمانداروو یەکتاپەرستن, هەروەها بە پەروەردەیەکی ئیسلامیانە کە لە ڕووی فکرو ڕەوشتو سیاسەتو ئابووریو کۆمەڵایەتییەوە بەهێزیان بکات, بە شێوەیەك کە بە تەواوی بزانن ئێمە جیاوازین لەوەی لەو کەناڵانەدا دەیبینن. بەو شێوەیە دەتوانین قسەو کردەوەو ڕەفتارە پووچەکانیان بناسین, خۆ ئەگەر ئەو کارە ئەمجام نەدەین، هەموو جیهانی ئیسلام هاوکاریی یەکتر

[1] الدكتور محمد جلال العظم والدكتور حسن حنفي: المصدر السابق، ص٢٤١ .

[2] بڕوانە ئەم کتێبانە: محمد رشيد رضا: حقوق المرأة في الإسلام؛ الدكتور مصطفى السباعي: المرأة بين الفقه والقانون؛ الاستاذ بهى الخولي: الإسلام والمرأة المعاصرة؛ عباس محمود العقاد: االمرأة في القرآن .

نەکەین لەسەری، ئەوا تووشی فیتنەو بەدڕەفتاریەکی زۆر گەورە دەبینەوە، چونکە لە راستیدا راگەیاندنی بەجیهانیکردن زۆر ترسناکە. ئەمەش لە ڕێگای ئەم خاڵانەی خوارەوە ئەنجام دەدرێت:

١ – بایەخدان بە پەروەردەی خێزانی موسڵمان‌و رۆشنبیرکردنی رۆڵەکانی‌و ئاراستەکردنیان لە ڕێگای دەزگاکانی راگەیاندنی بینراوو بیسراوو خوێنراوەوە, هەروەها لە ڕێگای مزگەوت‌و وتاری هەینی‌و خولی پەروەردەیی قورئانیی بەردەوام یان کاتیی لە کاتی پشوەکانی هاویندا‌و وتنەوەی کۆوتاری زانستی‌و ئاراستەکەرەوە.

٢ – لە ڕێگای بەرنامەی پتەوی پەروەردەی ئایینی‌و زمان‌و مێژووو جوگرافیاو رۆشنبیریی ئیسلامیی‌و نیشتمانی گشتی‌و کتێبە زانستیەکانەوە.

٣ – لە ڕێگای کتێب‌و گۆڤارو رۆژنامەوخولیە تایبەتی‌و گشتییەکانەوە.

٤– لە ڕێگای چادرگا هاوینیەکانەوە، لەولأتێکدا یان لە چەند ولأتێکدا لە ولأتە ئیسلامییەکان بە گشتی.

٥ – لە ڕێگای ئاهەنگی گشتیی‌و کۆنگرەوە کە بەیناو بەین ببەسترێت لەولأتدا یان لە چەند ولأتێکدا.

٦ – لە ڕێگای شانۆگەری‌و فیلمەوە، لە سەر شانۆو هۆڵەکانی سینەماوە.

٧ – لە ڕێگای کەمکردنەوەی بەرنامە بیانیەکان‌و زیادکردنی بازنەی بەرنامە ئیسلامیی‌و نیشتمانییە راستەکانەوە, چونکە بەردەوامبوونی رەوشی ئێستای داموەدزگاکانی راگەیاندنی عەرەبی‌و ئیسلامیی مەترسیەکی گەورەیە بۆ داهاتووی نەوەکانمان, هەڕەشەی تواندنەوە لە رۆشنبیریی بەجیهانیکردنی تێدایە، چونکە ئێمە لەو داموەدزگایانەدا هاوکاریی دەزگاکانی بەجیهانیکردن لە بەدڕەفتارکردنی نەوەکانمان‌و بلأوکردنەوەی بەها بێڕەوشتییەکان لەناو خێزانەکانماندا دەکەین. ئەمەش لە راستیدا گرفتێکی زۆر گەورەیە کە پێویستە لەسەر دڵسۆزان‌و ئەوانەی دەرکی پلانەکانی بەجیهانیکردن دەکەن وریای ئەوەبن، پێش ئەوەی لە دەستمان دەربچێت چارەسەری خێرا دیاری بکەن بۆ کۆتایی پێهێنانی[1].

٨ – لە ڕێگای یەکێتی ئەو مەعریفەیەی کە پەروەردەی ئیسلامیی لەسەر دروست بووە، کە پێویستە تاکەکان لەسەر ئەو شێوازە شارستانییە ئیسلامییە دابڕژێن, کەسایەتی کامڵیان لە لایەنی بیروباوەڕو زەوق‌و فکرو ماددەوە لێدروست بکرێت. بۆ ئەوەی نەتەوەکانمان پتەوو یەکریز بن‌و کەلێن نەهێڵنەوە بۆ دزە کردنی شتە هەڵخەڵەتێنەکانی بەجیهانیکردنی دوور لە ئایین‌و بەرەڵایی سێکسیەوە. ئێمە لە ولأتە ئیسلامییەکاندا پێویستمان بە هەرەوەزێکی ئیسلامییانەی گشتگیر هەیە، ئەمەش لە ڕێگای نەخشەیەکی شارستانیی هاوچەرخەوە کە هەموو دەوڵەتان‌و داموەدزگا رەسمی‌و میللیەکان‌و کۆمەڵەو حیزبەکان بەشداری تێدا بکەن, چونکە رووبەڕووبوونەوەی بەجیهانیکردن ئەوەندە پڕ مەترسیە کە پێویستە لە پلەو پایەیەکی بەهێزەوە بەرامبەری رابووەستین, بۆ ئەوەی گۆڕانکاریەکی نەوعیی لە ژیانی خەڵکیداو لە تواناکانیاندا بۆ ئەو رووبە ڕووبوونەوەیە بکەین.

کۆمەڵگای ئیسلام پێویستە بەهاو رەوشت‌و هۆکانی هێزی ماددی‌و ئاشتی‌و ئاسایش هەموو پێکەوە کۆبکاتەوە, ئەمەش رووناداتت بە شۆڕشێکی زانستیانە نەبێ کە هێزی کارکردن‌و بەرهەمهێنان‌و بەدەستهێنانی تواناو بەربەرەکانێمانی تێدا بتەقێنێتەوە بە تایبەتی لە لایەنی بەدەستهێنانی مەعریفەو رۆشنبیریی‌و توانای ئابووری‌و سەربازی‌و فکریی, کەواتە لێرەدا پێویستمان بە فێرکردنێکی پێشکەوتوو ئامانجداری چالاک هەیە کە یەکەمین چەکی رووبە ڕووبوونەوەی بەجیهانیکردنە[2].

**فکری سەربازیی جیهادیی:**

لەکاتێکدا ئیسلام ئایینی یەکتاپەرستی پاک‌و ئایینی راستیی‌و هێزو ئازادیە, گومانی تێدا نییە کە هاوبەشیدانەران‌و پوچگەرایان‌و ستەمکاران بۆ ئەوەی کۆسپ بخەنە ڕێگای ڕێنماییەکانی‌و ڕێگربن لە نێوان ئیسلام‌و داڕشتنی مرۆڤی

---

[1] العولمة والمستقبل، ص٩٩.

[2] الدكتور زكي حنوش: المصدر السابق، ص١٤٥.

موسڵمانی ئیمانداری بەندەی تەنها خوای پەروەردگار رووبەڕووی دەبنەوە.

لەو ڕێگایانەش کە ئەو خراپکارانە گرتیانەبەر دژی ئیسلامو ئەو خێرەی کە هێنای بۆ مرۆڤایەتی، بەکارهێنانی هێزو چەك بوو بۆ کوژاندنەوەی روناکیەکەیو ترازاندنی مرۆڤ بەرەو بازنەی خوانەناسیو بەرەڵاییو تاریکی.

خوای گەورە فەرمووویەتی: (الله ولی الذین امنوا یخرجهم من الظلمات الی النور والذین کفروا اولیاؤهم الطاغوت یخرجونهم من النور الی الظلمات اولئك اصحاب النار هم فیها خالدون) البقرة/ ٢٥٧، واتە: خوا پشتو پەنای ئەوانەیە کە باوەڕیان هێناوە لە تاریکی دەریان دەکات دەیانخاتە رووناکیی، ئەوانەش کە ڕێبازی کوفریان گرتووە پشتو پەنایان (تاغوتە)لە رووناکیەوە دەیانبات بۆ تاریکی، ئەوانەن کە نیشتەجێی دۆزەخن بۆ هەمیشە. هەر بۆ ئەوەش بوو ئیسلام یاسای جەنگی دانا، بۆ ڕەتکردنەوەی دەستدرێژیو رزگارکردنی ستەملێکراوانو رێنمایی کردنی جیهانیان, ئەگەرچی دژی خوێن ڕشتنە,وەکو لە قورئاندا فەرموویەتی: ( کتب علیکم القتال وهو کره لکم وعسی ان تکرهوا شیئا وهو خیر لکم..) البقرة/ ٢١٦، واتە: جەنگتان لەسەر نووسراوە خۆ پێشتان ناخۆشە، بەڵام لەوانەیە خێر لەو شتەدا بێت کە پێتان ناخۆشە.

جەنگیش ناتوانێت مەبەستە جوانەکانی ئیسلام بهێنێتەدی، مەگەر جیهادێکی گشتگیر پێشی بکەوێت, کە هەموو خانەیەك لە خانەکانی کۆمەڵ بگرێتەوە، لەو بارەیەشەوە فەرموویەتی: (یا ایها الذین امنوا هل ادلکم علی تجارة تنجیکم من عذاب الیم تؤمنون بالله ورسوله وتجاهدون في سبیل الله باموالکم وانفسکم ذلکم خیر لکم ان کنتم تعلمون ) الصف/ ١٠-١١، واتە: ئایا بازرگانیەکتان پیٚ بڵێم کە لە سزای سەخت رزگارتانکات، ئیمان بێنن بە خواو پێغەمبەرەکەیو تێبکۆشن لە رێی خوادا بە سامانتانو گیانتان، ئەوە باشترە بۆتان ئەگەر بزانن.

بە گوێرەی ئەو ئایەتانەی سەرەوە، ئامادەکردنی هێز بەمانا گشتییەکەی ترساندنی دوژمنانەو رێگری کردنیانە لە بیرکردنەوە لە دەستدرێژیی. هەر بۆیە خوای گەورە فەرموویەتی: (واعدوا لهم مااستطعتم من قوة ومن رباط الخیل ترهبون به عدو الله وعدوکم واخرین من دونهم لاتعلمونهم الله یعلمهم وما تنفقوا من شئ فی سبیل الله یوف الیکم وانتم لاتظلمون ) الانفال/ ٦٠، واتە: چەند دەتوانن هێزو تفاقی جەنگ ئامادە بکەن بۆیان بۆ ئەوەی دوژمنی خواو دوژمنی خۆشتانی پیٚ بترسێنن، هەرچی لە رێگای خوادا سەرفی بکەن خوا پێتان دەداتەوە، هیچ ستەمیشتان لێناکرێت. ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەردەمی پێغەمبەرو ε خەلیفەکانی راشدینو سەردەمە دواییەکانیش, دەبینین ئامادەکردنی سوپا بۆ ئامانجی جوان لە ئامانجەکانی موسڵمانان بووە، بەوەش بەرگرییان لە ئایین کردووەو دەستدرێژیی دوژمنانیان ڕەت کردۆتەوە.

بەڵام موسڵمانان لەم سەردەمانەی دواییدا، بە کزبوونی ئیمانیانو کوژاندنەوەی بڵێسەی شارستانیەتەکەیان, داهێنانیان لە بواری ژیاندا راوەستاوە. پشکی سوپای ئیسلامیەکانیش لەو بوارەدا پشتگویٚ خستنێکی زۆر بووە، هەر بۆیە دوژمنان غافڵگیریان کردین، وڵاتەکانیان داگیر کردین, سامانەکانیان تالاّن کردین، دژی ئایینەکەمان راوەستان, پلانیان گێڕا دژی داهاتوومانو بەو پەڕی ژیرییو نەخشەسازییەوە جێبەجێکرا.

ئەمڕۆش ئەگەر بمانەویٚ نەخشەی رووبە ڕووبوونەوەی بەجیهانیکردن بکێشین, مەترسیەکانی لەسەر ئێستا و داهاتوومان کەم بکەینەوە, دەبیٚ بچینە سەردەمێکی سەربازییەوە لە فراوانترین دەروازەیەوە, سوپاکانمان ڕێکبخەین, بە بیروباوەڕی جیهادو ڕەوشتەوە دایبڕێژین, بە بەهێزترین هۆکاری ژیاندنەوەی عەقڵی مرۆڤ هاوکاری بکەین، لە چەكو رێکخستنو مەشقو زانستی سەربازییەوە. تویژینەوەی زانستیی لە هەموو بوارەکاندا بۆ ئەنجام بدەین، سامانی زۆری بۆ تەرخان بکەین, ئەمەش بۆ ئەوەی سوپاکانمان بچنە ریزی سوپا بەهێزەکانی جیهانەوە.

مامۆستای دکتۆر زەکەریا بەشیر ئیمام دەڵێت: هێز جۆری زۆرە، پێوەرەکانیش دەبیٚ بەپێی

گەشەکردنی زانستی جەنگو رۆشنبیریی سەربازیی بێت, بەڵام هەندیٚ لایەن هەن پەیوەندی بە مرۆڤو دروستکردنی تواناکانیەوە هەیە، دەبێت لە هەموو روویەکەوە توانای سەربازییو دەروونیو جەستەییو شارەزایی سەربازیی ئامادەبکرێتو بەم شێوەیە:

١ – بنیاتنانی بیروباوەڕی جەنگیی بەهێز لە دڵو دەروونیا, دەبێ قەناعەتی هەبێت کە لە پێناو کێشەیەکی دادگەردا دەجەنگێ, ئەگەر بەو ئیرادەیەوە نەبێت, ئەوا لەوانەیە هەموو شتێکی –وڵات, نیشتمان, بیروباوەڕ, سەروەریی،...– لەدەست بچێت.

٢ – بنیاتنانی هێزە دەروونیەکان, لە گرنگترینیان ئیمان بە خواو ئەوەی کە خوا پشتگیری ستەملێکراوانە, هەروەها هێزی ئارامگرتن و بەرگەگرتن و گوێڕایەڵیی و گیانی خۆبەختکردنی تێدا دروستبکرێت.

٣ – بنیاتنانی توانا ژیرییەکان کە یارمەتیدەرن بۆ نەخشەکێشان و دانانی پلانی ستراتیژیی..هتد

٤– شارەزابوو لە زەوی جەنگ و سروشتی ژینگەی سروشتیی، و ئەوەی پێویستە سەرباز ئاگادار بێ لێی.

٥ – ناسینی دوژمن و هەواڵەکانیی و جۆری چەکەکانیی و شێوازی جەنگیی دەروونیی..هتد.

٦ – بنیاتنانی توانای جەنگیی لای سەرباز بە راهێنانی جەستەیی و کەسێتی جەنگاوەرو توانای بەرگەگرتنی.

٧ – گوێگرتن بۆ فەرمانەگانی بەوپەڕی ژیریی و هۆشمەندییەوە, دوورکەوتنەوە لە ناکۆکی لەگەڵ سەرکردەکان و سەربازەکاندا.

٨ – ناسینی رێگاو بانەکان و بەرزونزمیی سەرزەویەکان..

٩ – فێربوونی جەنگی شەوو رۆژ.

١٠ – شارەزابوونی شێوازەکانی جەنگ و دەستپێشخەریی لە هێرش کردنە سەر دوژمن و تێکشکانی تواناکانی.

١١ – هێرشی جەنگی دەروونیی و ئابووریی و مەعنەوی بۆ سەر دوژمنان و پەکخستنی توانا جەنگیەکانی.

١٢ – خزانە ناو دوژمن لەرووی ئاسایش و هەواڵگریی و کۆکردنەوەی زانیاری لەسەری..

١٣ – بەکارهێنانی هەموو شێوازەکانی هەڕەشەو ترساندنی دوژمن, کارکردن بۆ درز خستنە ریزەکانیی و بێبەشکردنی لە هاوپەیمانان و سوتاندنی زەوی ژێرپێی.

١٤ – بەدەستهێنانی هاوپەیمان لە دانیشتوان و خەڵکی شوێنی جەنگەکە, یان لای کەمی بێلایەنکردنیان.

١٥ – کارکردن لە پشت دوژمنەوە بۆ بڕینی یارمەتیەکانیی و ئابلۆقە خستنەسەری.

١٦ – هاندانی سەربازان و بەرزکردنەوەی ورەیان بە هەموو شێوەیەک و رێز لێگرتنیان و مژدە پێدانیان بەوەی کە ئەوان لەبەر خوا دەجەنگن لە پێناو راستیی و بەدەستهێنانی مافەکانیان.

١٧ – دەبێ سەرکردە سەربازییەکان نموونەی خۆبەختکردن و ئازایەتیی و قوربانیدان بن، کاروباری جەنگ بە باشیی بەڕێوەبەرن, لەوەش پلانی باش و فێڵی جەنگ, وەکو پێغەمبەر ε فەرموویەتی: جەنگ هەڵخەڵەتاندنی دوژمنە[1].

جیهانی ئیسلام پڕیەتی لە خێرو بێرو سامان و ژیریی و شارەزایی. ئەگەر دەوڵەتە ئیسلامییەکان هاوکاریی یەکتر بکەن و زانیاریی بگۆڕنەوە, بۆ گەیشتن بە پلەی پێشکەوتووی هێز لە رووی زانستیەوە تەواوکاری یەکتربن, ئەوا دەتوانێ سەدان فەیلەق ببزوێنێ, دەیان هەزار فڕۆکەو مووشەک بخاتە رووی ئاسمان, دەیان کەشتیگەل بخاتە دەریاکانەوە. ئەم کارە پڕمەترسیەش پێویستی بە سیاسەتی سەربەخۆو نەخشەی وردو بڕیاری جێبەجێکراو هەیە.

سەرکردەکانی بەجیهانیکردنی نوێ، بۆ بڵاوکردنەوەی ستەم و درۆکانیان و پلیشاندنەوەی ئەوانەی بەرامبەریان رادەوەستن هێزی بەهێزو خێرایان ئامادەکردووە،, بە ئاشکراش ئاماژە بەو هێزە ستەمکارانەیان دەکەن, کە دەستدرێژکارن بۆسەر جیهانی ئیسلام, بەراشکاویش دەڵێن مەترسیی تازە تەنها ئیسلامەو بەس.

ئەوەی مونەزیرەکانیان نووسیویانە, بەڵگەن لەسەر ئەوەی وتمان, هینتگتۆن کە مونەزیرێکی دامودەزگا ستەمکارە سەرمایەداریەکانی جولەکەیە، موسڵمانان واپیشان دەدات کە جەنگخوازو توندڕەوی ئەم جیهانەن, ئیتر گوێ نادات بەو هەموو ستەم و دەستدرێژیی و داگیرکردنەیان لەم سەردەمەدا, بەوەش هێزە شەڕانیەکانی بەجیهانیکردن لە دژیان هاندەدات[2].

---

[1] المصدر نفسه، ص٥٠-٥٢.

[2] صدام الحضارات، ص٣٨-٤٠.

مانەوەی موسڵمان لەسەر ئەم حاڵەی كە ئێستا تیا دەژین لە دواكەوتوویی‌و پارچە پارچەیی‌و نەبوونی نەخشەی ژیرانەو درووست نەكردنی چەكی گونجاو بۆ ئەم ناكۆكیەی كە دوژمنانیان بە هەموو هێزو فێڵ‌و پلانەكانیانەوە دەیانەوێ لە دژیان بیكەن, ئەوا دەیاندات بە دەستی دوژمنەكانیانەوە. لە فەرهەنگی پێشبڕكێی نێوان گەلاندا بێتوانا هەمیشە سەرشۆڕە.

ستەمی ئەمریكا ناتوانێ خۆی بەرامبەر بە یەكێتی‌و هاوكاری نێوان موسڵمانان رابگرێ، چونكە سەركردەكانیان باش دەزانن ئەوانە روبەڕوی دیوارێكی پتەوی درێژو پان دەبنەوە، لەبەر ئەوە هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدان كە موسڵمانان پارچە پارچە بكەن, هۆكاری هێزیان لێ قەدەغە بكەن، بۆ ئەوەی بە ئاسانی زاڵ ببن بەسەریاندا بە تاك تاك، وڵات لە دوای وڵات بیانهاڕن، تا ئەو لاوازی‌و دووری لەیەك‌و دواكەوتوییەیان بەردەوام بێت.

تیۆرسینانی جولەكەو هیتریش لە بەجیهانیكاران، پەیوەندی گفتوگۆی نێوان شارستانیەتەكانیان گۆڕیوە بۆ پێكدادانی شارستانیەتەكان, چونكە ئەو ستەمكارانە تەنها لە رێگای ناكۆكی نانەوەو جەنگ‌و كاولكاریەوە دەتوانن سامان لە بانقەكانیاندا كەڵەكە بكەن.

پێویستە موسڵمانان‌و دەوڵەتەكانیان باش ئەو راستییە بزانن، چونكە بەجیهانیكاران ئەوان شانبەشانی دوژمنەكانیان داناون, شانبەشانی چین, بەڵكو لە چینیش زیاتر, كەواتە موسڵمان بەگوێرەی ئەوە پێویستیان بە یەكێتی‌و هێز هەیە، لەگەڵ چوونە ناو سەردەمی شارستانیەتی ئیسلامی نوێوە بە ژیرانەو پلانی بەهێزەوە، نەك بۆ هێرش كردنی سەر رۆژئاواو خەڵكی تر, بەڵكو بۆ بەدەستهێنانی مافەكانیان‌و بەرگریی لە خۆیان‌و نەوە داهاتووەكانیان.

## بەرەو یەكێتیی ئوممەت

رەوشی دواكەوتووی وڵاتە ئیسلامییەكان لە سەدەی دواییدا، هانی داگیركەرانی داوە كە ئەم وڵاتانە داگیر بكەن، بەرگریكردنی ناتەباو ناشارستانتیی, سوودی نەبوو بۆ رێگریی لەو داگیركردنە. ئەو دوژمنە داگیركەرانەش لە پێناو بڵاوكردنەوەی بیروڕاكانیان لەناو موسڵماناندا چالاكیی زۆریان لە رووی رۆشنبیریی‌و پەروەردەیی‌و راگەیاندنی چڕوپڕەوە ئەنجامدا. هەربۆیە هەندێك باوەڕی هێنا بە سەرمایەداریی تاكپەرست، هەندێكی تریش بە كۆمۆنیستی كۆمەڵیی(جماعي), سێیەمیش باوەڕیان هێنا بە نەتەوەگەریی دوور لە ئایین، چوارەمیش بە نیشتمانگەریی عەلمانیی، پێنجەمیش بە شۆسیالیستیی، ئا بەو شێوەیە بێ گەڕانەوە بۆ تەوەرەو خولگەیەكی جێگیر كە هەموو بۆی بگەڕێنەوە.

وەرگرتنی ئەو بیرۆكە جیاجیایانە تەنها لە رێگای سەپاندنی داگیركەرانەوە نەبوو, بەڵكو لە ئەنجامی لێكخشانی شارستانی بوو لە نێوان نەتەوەیەكی دواكەوتووی وشكەڵاتوو, كە نە فكرو نەداهێنان‌و نە مەعریفەی بەرهەم نەهێناوە، لەگەڵ نەتەوەگەلی داگیركەری رۆژئاوایی بەهێز, كە پێی ناوەتە سەردەمی شارستانی نوێوە, لە رێكخستن‌و بنیاتنانی ژیاندا چاكترین داهێنانی كردووە، ئا لێرەدا كارەساتی گەورە لەوڵاتانی ئیسلامیدا روویدا, چونكە یاسای چاولێكەریی دۆڕاو بۆ سەركەوتوی براوە كاری خۆی كرد, نەوەكانمان بێ ئەوەی توانای جیاكردنەوەی چاك‌و خراپی ئەو فكرە هاتووانەیان هەبێت، یەك لەدوای یەك بەرامبەر بەو فكرە هەڵخەڵەتێنەرانەی لە رۆژئاواوە هاتن تێكشكان.

بەڵێ كاردانەوەی ئیسلامیی ئاشتیخوازانە، یان توندڕەوانە لەدژی ئەو رەوشە خراپانەی پارچە پارچەیی‌و شپرزی‌و ناكۆكی‌و پێكدادان, ئەوەبوو كە ئیسلامییەكان بانگەوازیان كرد بۆ گەڕانەوە بۆ قورئان‌و سوننەتەكانی پێغەمبەرε, ئا لێرەدا پێكدادانێكی فكریی‌و خوێناوی لە نێوان ئەوان‌و خاوەن بنەما بێدینییەكانی دژ بە بنەماكانی ئیسلام روویدا, ئەوانەی هێزە داگیركەرەكان یارمەتیان دان بۆ گرتنەدەستی حوكمی وڵاتە ئیسلامییەكان، ئەو بارودۆخەش نزیكەی نۆ سەدە درێژەی كێشا، بە شێوەیەك كە ئەو ناكۆكیە زیانێكی گەورەی گەیاند بە بزاوتی جوڵانەوەی ئیسلام بەرەوپێش, چونكە نەتەوە پەرستە عەلمانیەكان‌و نیشتمانگەرە دوور لە دینەكان‌و وجودییە خوانەناسەكان‌و كۆمۆنیستە ماددیەكان, بە هیچ جۆرێك ئامادە نەبوون لابكەنەوە بەلای ئیسلامدا, بەڵكو ئیسلام‌و هەڵگرانی بیروباوەڕەكەیان بە

دوژمنی راستەقینەی خۆیان دەزانی، هەر بۆیە تۆمەتی ناڕاستو درۆیان دەخستە پاڵیان, تۆمەتی ناڕەوای زۆر، تۆمەتباریان کردن بە کۆسپی ڕێگای پێشکەوتن، تووشی تەنگو چەڵەمەی زۆریان کردن، لە گرتنو کوشتنو راونان.

ئینجا وردە وردە خاوەن ژیرییەکان کەوتنە پرسیارکردن، ئایا حوکمڕانە دوور لە ئایینەکان، ئەوانەی حوکمی وڵاتە ئیسلامییەکانیان کردووە، تا ئێستا چیان ئەنجامداوە؟ ئەوانەی کە هەڵگری بیروباوەڕی نەتەوەپەرستیو نیشتمانگەرییو مارکسیزمن، کۆمەڵگایان پێشخستووە؟ ئایا تەباییو یەکبوونیان بۆ کۆمەڵگا ئەنجامداوە؟ ئایا گەشەپێدانێکی سەرکەوتوویان ئەنجامداوە؟ ئایا دادگایەکی دادگەریان دامەزراندووە؟ ئایا پەروەردەیەکی جوانو فێرکردنێکی گونجاویان ئەنجامداوە؟ ئایا رێزی مرۆڤی موسڵمانیان پاراستووە؟ ئایا بە راوێژوو شورا حوکمڕانییان کردووە؟ ئایا قەڵەمە دووڕووەکانیان لە نووسەرو ئەدیبو شاعیرو رۆژنامەنووسانیان, لە پێناو خزمەتی جەماوەردا خستۆتەکار, یان بۆ بەرژەوەندی خۆیان؟ ئایا هەژارییان چارەسەر کردووە؟ئایا ئابوورییەکی پتەوی دادگەریان لە جیهانی ئیسلامدا دامەزراندووە, یان سامانی میللەتانیان لە خزمەتی ئارەزووە چەپەڵەکانی خۆیانو کردنەوەی کۆشكو تەلارو رازاندنەوەیانو پاراستنی حوکمڕانییە ستەمکارەکانیاندا بەفیڕۆداوە؟

ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە دان بەوەدا بنێن، کە بە چاولێکەریو کارەسات لە دوای کارەسات کە بە سەریاندا هێناوە نەتەوەکانیان سڕیوەتەوە، بەوپەڕی سەرشۆڕشیەوە ملیان کەچکرد بەرامبەر ستەمی ئەمریکای جولەکە؟

ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە لایەك بکەنەوە بەلای ئیسلامییەکاندا، بەخۆیاندا بچنەوەو بزانن کە چ تاوانێکیان لە دژ ئەنجامداوە؟ با لە خۆیان بپرسن: ئایا راستیەکانی ئیسلام تێگەیشتوون؟ ئایا ناکرێ بە شێوەیەکی هاوچەرخانەی رۆشنگەریانە تاقیی بکەنەوە تا بزانن ئەنجامە چی دەبێت؟

– ئەگەر نەوەکانیان لەسەر ئیمانو دڵسۆزیو دوورکەوتنەوە لە گوناه بەگشتیی پەروەردە بکردایا، چییان دەدروییەوە؟

– ئەگەر بگەڕانایاتەوە بۆ راوێژ بە میللەتانیانو گوێڕایەڵیی بۆیان, چی رووی دەدا؟

– ئەگەر لە پێناو ئەنجامدانی گەشەپێدانێکی گشتگیردا سیستمە گشتییەکانی شەریعەتی ئیسلامییان پیادە بکردایا، دەگەیشتن بە چی؟

– ئەگەر بگەڕانایاتەوە بۆ سیستمی پەروەردەو فێرکردنو پشکی هەر مرۆڤێك لە ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورەدا, چۆن بەهاکان پەرەیان دەسەند, هەستەکان یەکانگیر دەبوون, عەقڵەکان داهێنانیان دەکرد, بەو شێوەیە بزاوتی وەبەرهێن ملی رێگای دەگرت.

– ئینجا ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە ئیسلامییەکانیش لە خۆیان بپرسن: ئایا چی بکەن لەگەڵ خۆیاندا؟ ئایا تێکەڵکردنی وەحی خوایی بە بیروڕای مرۆڤەکان، کە بۆ سەردەمی خۆیان ئەنجامیان داوەو لە واقیعی خۆیاندا بیریان کردۆتەوە، سوودی بە ئێمە گەیاندووە؟

– ئایا پێویست نییە لەسەریان کە نیگا(وحي) خوایی جیابکەنەوە لە مێژوو کە دەستکردی باوو باپیرانیانە بە چاكو خراپەوە؟

– ئایا پێویست نییە لە سەریان کە بچنە ناو سەردەمی نوێوە، بۆ ئەوەی داهاتووی نەتەوەکەیان بنیات بنێن, ئیتر باس لە رابووردوو کردن کەمبکەنەوە؟

– ئایا دڵسۆزییە بۆ خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ کە بگەڕێینەوە بۆ واقیعی ئێستامان, کە پڕیەتی لە ناکۆکی سەلەفیو سۆفیو ئەشعەریو حەنبەلیو جوهەمیو سەننەو شیعەو... ئەو بیروباوەڕانەی کە لەگەڵ ناکۆکیەکانی سەردەمی خۆیاندا رۆیشتوون, ئەمڕۆش ئێمە دەیان گرفتی شارستانی نوێمان هەیە کە پێویستی بەوەڵامی راست هەیە؟

– ئایا بۆ رووبەڕووبوونەوەی شارستانی نوێمان, بۆ بنیاتنانی میللەتەکەمان رێگەچارە لاوەکیە رابووردووەکان کە باوی نەماوە سوودمان پێ دەگەیێنێ؟

– ئایا پێویست نییە لەسەر ئیسلامییەکان کە قەناعەت بە هەڵگرانی بیروڕا رۆژئاواییە پچڕ پچڕەکان بکەن, کە رێگە

چارەی ئیسلام باشترەو بگەڕێنەوە بۆ پرۆگرامێکی گشتگیر لە تێگەیشتن لە ئیسلام، بە عەقیدەو شەریعەت و رەفتاریەوە, بە شێوازێکی نوێ و پرۆگرامێکی هۆشمەندەوە, کە پشت بە زانست و عەقڵ و وەحی ببەستێ و بەس؟

میللەتەکەمان ئەمڕۆ رووبەرووی بەجیهانیکردنی ستەمکار دەبێتەوە، لە کاتێکا لە نێوان ئێمەو خەڵکی شارستانی دەسەڵاتداردا بۆشاییەکی زۆر هەیە, ئێمە زۆر دواکەوتووین لەوان.

ئایا لەم رووبەڕووبوونەوە مێژووییە گەورەیەدا بۆ یەکبوونی میللەتەکەمان و بەهێزکردنی و بنیاتنانی لەسەر رەسەنایەتی و تایبەتمەندیی خودیی مرۆڤایەتی، پێویستمان بە خولگەیەکی جێگیرو رەسەن و هاوسەنگ نییە، کە لە حوکمدا بۆی بگەڕێینەوەو لە پێناو راپەڕین بۆ بنیاتنانی میللەتەکەمان سەرلەنوێ ناکۆکیە تایبەتیەکانمان لەبیر بەرینەوە؟

ئایا جگە لە ئایینە مەزنەکەمان، خولگەیەکی سەقامگیری هاوسەنگی رەسەن دەدۆزینەوە، ئەو ئایینەی کە هاوکێشەی بنەڕەتییە لە ژیانی میللەتەکەماندا؟

دوژمنانی ئیسلام ئەمڕۆ بە ئامرازە چەپەڵەکانیانەوە، بۆ ئەوەی میللەتەکەمان تیابچێت و خۆمان بدەین بەدەستەوە هەموویان دەیانەوێ لەو بنەڕەتە پتەوە لامانبدەن، وەکو پاشکۆیەکی سەرشۆڕ دەست هەڵبگرین لە سەربەرزیی و یەکێتی و مافە بنەڕەتیەکانمان[1].

ئەزموونی سەدەیەکی تەواو لە رابەرایەتی لە کۆمەڵگا ئیسلامییەکانداو دوور لە سیستمی ئیسلام، بۆ عەلمانیەکانیشی سەلماند کە ئەوان هەڵەبوون لە دوورخستنەوەی ئیسلام لە ژیان، هەر بۆیە وردە وردە دەستیانکرد بەلاکردنەوە بەلای ئیسلامدا, بەڵام بە پلەی جیاواز, بانگەشەشیان کرد بۆ گرتنی کۆڕو وتووێژ لە نێوان ئەوان و ئیسلامییەکاندا. ئەمەش خۆی بۆ خۆی رەوشتێکی دروستی خوازراوە, بە تایبەتی لە فەلەستین، پێویستیان بە وتووێژو پێکەوەژیان و نزیکی هەیە، بۆ ئەوەی هەموو پێکەوە بگەنە شێوازێك هەموویان کۆبکاتەوە لەسەر کێشە چارەنووس سازەکان و رووبەڕووبوونەوەی ئەو مەترسیانە, ئەگەرنا ئەوا دوژمن لە حەشاردایە، لەوانەیە دەلاقەی رووناکیمان لەسەر دابخات.

هاوکاریی هەمووان لە چوارچێوەی حوکمی شوراداو رێکەوتن لەسەر کێشە چارەنووس سازەکان، هاوسەنگیی دەگێڕتەوە بۆ ئوممەت, هیواش بۆ نەوە نوێکان, ئەو کاتە هەست دەکەن بە خۆشیی هاوکاریی و یەکبوون, بەوپەڕی بەرپرسیارییەوە دەجوڵێن. ئەو کاتە لەوانەیە ئەمە دەستپێکێکی نوێی بەهێز بێت بۆ رووادانی پەرەپێدانی راستەقینەی گشتگیر, کە ئوممەت لە تاریکیەکانی ئەم سەدانەی دوایی دەربێنێ و بەرەو رووناکیی هێڵە دڵسۆزەکان لە پێناو هەستانەوەو راپەڕین و پێشکەوتندا.

لەوانەیە توێژەرێکی بەپەرۆش بپرسێت: ئەو کێشە چارەنووس سازانە کامانەن کە ئەمریکاو هاوپەیمانە بەجیهانیکارەکانی زایۆنیزمی جیهانیی لە پشتەوەیەو هەڕەشە لە وڵاتەکانیان دەکات و پێویستە ئیسلامییەکان و نەتەوەییەکان و نیشتمانگەراکان لەم ماوەی گواستنەوەیەدا لەسەری رێکەون؟

دەڵێین: دەکرێ هەموویان لەسەر پەیماننامەیەك رێکەون بەم شێوەیەی خوارەوە :

یەکەم: پارێزگاریی تەواو لە سەربەخۆیی شیاویی ئوممەت و رێگەنەدان بە دەستێوەردانی بیانیی ستەمکار بۆ لاوازکردنی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ.

دووەم: پاراستنی سەروەت و سامانی ئوممەت لە لەناوچوون و بەفیڕۆدان و دزیی و دانانی یاسای زامن بۆ قەدەغەکردنی خراپ رەفتارکردن.

سێیەم: بە یەك ڕیز راوەستان بەرامبەر فەرمانڕەوایان و هەوڵدان بۆ رێگریکردن لە تاکڕەوی و ستەم و لادان و ئامۆژگاری کردنی بەردەوامیان لە دووتوێی میدیاکانی راگەیاندنەوە, دوور لە توندڕەوی و شۆڕش و خوێن رشتن، چونکە ئەو رەفتارانە خێر ناهێنێ, بە تایبەتی لەم بارودۆخەی ئێستاماندا.

فشاری بەردەوامی بە کۆمەڵ لەسەر فەرمانڕەوایان دەبێتە هۆی گێڕانەوەیان بۆ لای راستی و نزیکیان دەکاتەوە لە

[1] منير شفيق: المصدر السابق، ص٥١.

گەلانیان, بەمەش هەڵویستی وتووێژیان لە کێشەکانی پەیوەندیو گرفتە دەرەکیەکاندا بەهێز دەکات.

چوارەم: پشتگیریی فەرمانڕەوایان لە کاتێکا هێرشێکی بیانیی روودەکاتە وڵاتو لە بیربردنەوەی هەموو جیاوازیەك، چونکە بەرژەوەندیی بەرزی گەلو پاراستنی سەربەخۆییو سەرزەویو ئابرووی ئەگەر گەیشتبێتیشە ناکۆکیی لە پێش هەموو جیاوازیەکی ناوخۆیدایە.

پێنجەم: ڕێکەوتن لەسەر هەموو ئەو شتانەی ڕۆح دەگێڕێتەوە بۆ دیاردەی هاوکاریی ئیسلامیی, دانانی ئەمەش بە نەگۆڕێك کە وتووێژ لەسەری دروست نییە.

شەشەم: دەرنەچوون لەو نەگۆڕە یەکلاییانەی کە لە ڕێگای سروشەوە (وەحی) سەلمێنراون, ئەوەی کە موسڵمان نابێ بە موسڵمان هەتا باوەڕی بەوانە نەبێت, ڕێگەنەدانیش بە پێچەوانەکەی لە بواری ڕۆشنبیرییو پەروەردەو ڕاگەیاندندا.

حەوتەم: ڕەتکردنەوەی پلانەکانی زایۆنیزم, دان نەنان بە هەر ڕێکەوتنێك لەگەڵیا لەسەر حسابی سەرزەوی فەلەستینی پیرۆز, هەوڵدان بۆ ئامادەکردنی ئوممەت بۆ خەبات دژی, دەبێ باوەڕیش بەوە هەبێت کە ئەوەی بەهێز داگیرکراوە, بەهێز نەبێ ناگەڕێتەوە، ئەگەر ئەو ناکۆکیە دەیان ساڵی تریش درێژە بکێشێت.

هەشتەم: پشت نەبەستن بە هێزە ملهوڕە گەورەکان، ئەوانەی دەیانەوێت دەست بگرن بەسەر سیاسەتی ئەم جیهانەدا، لە ڕوودانی گۆڕانکاریی لە جیهانی ئیسلامدا, چونکە هاوکاریی لەگەڵ ئەوانەدا هیچ خێرێك ناهێنێت، بەڵکو ئامانجی ئەوان بە ڕاشکاوی رووخاندنی ئیسلامو شپرزەکردنی موسڵمانانە.

ئەوان دەیانەوێت موسڵمانان هەندێکیان بەربدەنە هەندێکی تریان، دەبێ دروشمی هەموومان ئەوەبێت کە: بەخێوکردنی وشتر باشترە لە بەخێوکردنی بەراز.

نۆیەم: ئاڵوگۆڕی دەسەڵات لە نێوان ڕەوتە سیاسییەکاندا بە گوێرەی ئەم بڕوانامەیە، دەبێ یاسایەکی گشتیی بێت لە کۆمەڵگادا, بۆ ئەوەی ناکۆکی سیاسییو خوێناوی پایەکانی نەڕوخێنێ، ئەوەی لەم سەدەیەی دواییدا زیانی زۆری گەیاند بە بەرژەوەندی میللەتانمان، بە تایبەتی لە نیوەی دوایی سەدەی بیستەمدا.

دەیەم: ڕێکەوتن لەسەر بنەمای گشتیی بۆ ئاوەدانکردنەوەی وڵات, ئەمەش لە ڕێگای نەخشەگەلی جیاجیاوە کە پسپۆڕانی خاوەن شارەزایی زانستیی ڕێك بکەون لەسەری، بە شێوەیەك کە نەخشەگەلیی زانستی بێلایەن بێت.

یانزەیەم: نەسەپاندنی یەك بیروڕاو یا یەك ئاراستە لە کێشە مەترسیدارەکاندا، بە تایبەت ئەوانەی پەیوەندیان بە بەرژەوەندی نیشتمانو گەلانمانەوە هەبێت, باوەڕبوون بەوەی کە دەست هەڵگرتنی هەموومان لە شتێك لە بەرژەوەندی خۆمان یان نەخشەمان دەبێتە هۆی هاوبەشیەك کە هەموومان قازانجی تێدا دەکەینو دەڕژێتە بەرژەوندیی گشتیەوە.

دوانزەیەم: هەموو ڕێکبن لەسەر ئەوەی کە سوپا شورای پاراستنی نیشتمانە.

سیانزەیەم: ڕێکەوتن لەسەر بەها ڕەوشتییە باڵاکان کە هەڵقوڵاوی ئایینی میللەتو ڕەسەنایەتیو شارستانیەتە پڕشکۆکەیەتی، بۆ ئەوەی نەوەکان لەسەر ئاستێکی هاوبەش پەروەردە بکرێن کە هەموو پێی ڕازی بن، چونکە لەم قۆناغەدا پێویستمان بە ڕەوشتی جوان هەیە کە تۆوی خۆشەویستیو بەزەیی لە نێوان ڕۆڵەکانیدا بچێنێ.

چواردەیەم: بەرگریی لە بەجیهانیکردن پێویستی بە هاوکاریی کردنە لەسەر ڕەتکردنەوەی ئەو سیستمە کۆمەڵایەتییەی کە ڕێگا دەدات بە بەدڕەوشتی (الشذوذ الجنسي)و ئازادیی سێکسی بۆ پیاوو ژن, هەروەها ڕەتکردنەوەی بڕیارە پڕمەترسیەکانی کۆنگرەی ئافرەتانی جیهانیی کە بە ئاراستەی ئەمریکاو جولەکەو هێزە بەدڕەفتاریەکانی جیهان دەرکراون.

پانزەیەم: ڕێکەوتن لەسەر دانانی نەخشە بۆ لەناوبردنی نەزانییو برسێتیو نەخۆشیی لەناو هاووڵاتیاندا.

شانزەیەم: ڕێکەوتن لەسەر نەگرتنەبەری شێوازی دوور لە ڕەوشت کە دیموکراتیخوازە ڕۆژئاواییەکان لە ناکۆکی نێوان حیزبەکانیاندا لە هەڵبژاردندا دەیگرنەبەر, کە بە هەقو بە ناهەق یەکتر ڕسوا دەکەن لە پێناو بردنەوەی هەڵبژاردندا.

حەڤدەیەم: وتووێژی بەردەوام لە نێوان لایەنەکاندا کە دەبێتە هۆی نزیک کەوتنەوەی عەقڵەکان‌و دڵەکان, لە پێناو تواندنەوەی هەمووان لە چەمکی یەک ئوممەتداو برایەتی لە ئاییندا، ئینجا لەگەڵ‌و نیشتماندا. پێکهێنانی لیژنەگەلی هەمیشەیی هاوبەش لە شارەزایان بۆ توێژینەوەی کێشە بنەڕەتیە گەورەکان‌و دانانی نەخشەو پلان بۆ چالاکییە جیاجیاکانی ژیان.

هەژدەیەم: هەیەکە لەلای خۆیەوە هەوڵی چاندنی ئەم مانا بەرزانە لەناو جەماوەری موسڵمانانندا بدات, بۆ ئەوەی بچێتە ناخی هەموانەوەو هیچ شتێك نەتوانێ بیبزوێنێ, یا ئاڵوگۆڕیش لە بارودۆخدا رووبدات، بۆ ئەوەی هەمووان بە کۆمەڵ رابوەستن بەرامبەر بە بەجیهانیکردنی ئەمریکا, چونکە دوورخستنەوەی جەماوەر لە دەیە پێشوەکانداو رێگەنەدان پێی بە دروستکردنی ئێستای‌و داهاتووی لەلایەن حوکمڕانە ستەمکارەکانەوە، شکستی زۆری بەسەر ئوممەتەکەماندا هێناوە.

سەپاندنی یەك رێگا بەسەر زانایان‌و رۆشنبیران‌و سیاسییان‌و ئەدیبان‌و هونەرمەندان‌و..تاد بە تۆقاندن‌و زۆرکاریی‌و بەندکردن‌و ئەشکەنجەدان‌و کوشتن‌و بڕین, نەگبەتیەکی یەکجار گەورەبوو لە ژیانی ئوممەتەکەماندا بە دەستی کاربەدەستانیان.

ئەگەر گەلان دەست پێشخەریی بکەن جیاواز نابن، بەڵام ئەگەر حوکمڕانەکان ئەوانەی دوور لە رێسای میللەتان بیکەن ئەوە جیاوازی دروست دەکەن, جیاوازیشیان هەمیشە لە بەرژەوەندی دوژمنان بووە، بە تایبەتی زایۆنیەکان[1].

تاکە رێگا بۆ راوەستان بەرامبەر بە بەجیهانیکردنی ئەمریکای زایۆنی, رووبەڕووبوونەوەی لە لاوازترین ئیمانەوە، بە دەستپێك لە بیروباوەڕی ئوممەتەوەو هاوکاریی تەواو لە نێوان عەرەب خۆیان‌و عەرەب و موسڵمانان لەلایەکی ترەوە لە هەموو لایەنەکانی ژیاندا، بەڵام پارچە پارچەیی‌و ملکەچی بۆ سیاسەتەکانی بەجیهانیکردن خزمەت بە کەس ناکات, دەبێتە هۆی شکست‌و داڕوخانی زیاتر بەرامبەر بە کەللەڕەقیی ئەمریکاو ملهوڕیی زایۆنیی.

بەجیهانیکردنی ئەمریکا ملکەچ ناکات تەنها لە بەردەم ئیرادەی حەفتاو پێنج دەوڵەتی ئیسلامیدا نەبێت. لە کاتێکا هەموویان یەك سیاسەت دەگرنەبەر لە رووبەڕووبوونەوەی راستەقینەدا هەتا جەنگییش.

ئەمریکا بەرژەوندی خۆی لە جیهانی ئیسلامییدا هەیە، لەکاتێکا رووبەڕووی یەك ئیرادەی ئیسلامیی بوویەوە ناچار دەبێت لەگەڵیان رێکەوێت. ئا لێرەدا موسڵمانان دەبێ هەوڵی خۆیان بدەن بۆ ئەنجامدانی یەکێتی لە جیهانی ئیسلامدا, ناڵێم یەکێتی دەوڵەتەکان, ئەوە زۆر گرانە، بە تایبەتی لەم بارودۆخەی ئێستاماندا, بەڵکو مەبەستم یەکێتی عەقڵەکان‌و دڵەکان‌و بەرژەوەندییەکان‌و هاوکاریی تەواوە لە چوارچێوەی یەك کۆمەڵەی ئیسلامییدا, یا لە چوارچێوەی کۆنگرەی ئیسلامیی ئێستادا, بەشێوەیەك یەك سیاسەتی‌و یەك بازاڕی ئابووری‌و یەك نەخشەی گەشەپێدانی لەسەر بنەمای یەك ئوممەت لێ پەیدا ببێت. هەروەها تەنها یەکێتی سۆز بەس نییە، بەڵکو دەبێ ئەو یەکێتییە بزانێت چۆن دەچێتە ناو سەردەمی نوێوە, چۆن سوود لە هەلەکان وەردەگرێت، بۆ ئەوەی بگات بە باشترین ئەنجام.

رۆژئاوای خاچپەرست بە هۆکاری کینە مێژووییەکانی دژی ئیسلام‌و موسڵمانان, رێگا نادات بە موسڵمانان کە راپەڕن‌و یەك بگرن‌و بچنە ناو سەردەمی تەکنۆلۆژیای پێشکەوتووەوە. جولەکایەتی جیهانییش بۆ رێگرتن لە بەهێزبوون‌و یەکگرتنی موسڵمانان رێگەی ئەستەمیش دەگرێتەبەر, بەڵام ئەگەر موسڵمانان دڵسۆز بن لەگەڵ پەروەردگاریاندا، دەستیانکرد بە بنیاتنانەوەی ژیانیان لەلایەن خۆیانەوە، ئەوا پشت بەخوا بێ یارمەتی بەهێزەکان دەگەن بەوەی دەیانەوێت. یابان‌و ئەڵمانیا دوای جەنگی دووەمی جیهانی نموونەن لە بەرچاوماندا. ئەوان کۆمەکی مەرجداری بیانیان رەتکردەوە, هەر خۆیان رووبەڕووی قەدەری خۆیان بوونەوە،وا ئەمڕۆ گەیشتوون بەو هێزو توانایەی کە هەیانە.

ئابووریناسی میسری دکتۆر رەفعەت عەوەزی دەڵێت: مەسەلەی تەواوکاریی ئیسلامیی‌و ئەمڕۆ چۆن دەوڵەتە ئیسلامییەکان لەم رەوشەی ئێستادا، لە چوارچێوەی ئەو تەواوکاریەدا رێك بکەون, چونکە هیچ دەوڵەتێکی ئیسلامیی لە توانایدا نییە لە گەلەکۆمەی بەجیهانیکردن دەرچێت کە حەوت دەوڵەتە گەورەکە لە رێگای دامەزراوو رێکخراوە نێودەوڵەتییەکانەوە خەرجی بۆ دەکەن. کەواتە زەمانەتی دەوڵەتە ئیسلامییەکان لە گۆڕەپانی ئیسلامییەوە دەست پێدەکات, کە پانتاییەکی جوگرافی‌و ستراتیژی‌و ماددی‌و مرۆیی هەیە, بە تەواوکاری دەست پێبکات‌و بە یەکگرتن لە

---

[1] المصدر نفسه، ص١٠٧-١٠٨.

یەك سیاسەتی ڕێکوپێکدا کۆتایی بێت. جیهانی ئیسلام گەنجینەیەکی زۆر گەورەی سەرمایەو سامانی زیندوو کانزای هەیە جگە لە پێکەوە بەسترانی جوگرافیو تەواوکاری لە دەرامەتدا, لەبەر ئەوە ئەگەر بازرگانیەکی راستەقینە لە نێوان جیهانی ئیسلامییدا دروست بوو، دەتوانین لای کەمی لە پێویستیە ستراتیژیەکاندا پێویستیمان بە جیهانی دەرەوە نەبێت. ئا لێرەدا ڕۆڵی دامەزراوەکانی تەواوکاریی دەردەکەوێت چ لەسەر ئاستی ئیسلامیی گشتی بێت وەکو ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامیی، یا لەسەر ئاستی هەرێمایەتی وەکو یەکێتی مەغاریبیو ئەنجومەنی هاوکاریی کەنداو, یا یەکێتی کۆمارەکانی ئاسیای ئیسلامیی. بەڵام ئەوەی سەرسوڕهێنەرە ڕۆڵی ئەم دامەزراوانە تا ئێستاش هەر ڕۆڵێکی راوێژکارییەو هیچ شێوەیەك لە شێوەکانی پابەندبوون ناگرێتەخۆی[1].

ئێمە پێویستمان بە دروستکردنی مرۆڤی موسڵمان هەیە، دروستکردنێکی ئیمانی بەهێزو ژیر کە شانازیی بەخۆیەوە بکات, ڕەوشی ژیانی خۆی بگۆڕێت, شارەزای ڕەوشی میللەتان بێت, هێندە بە توانابێت کە بەڕاستیی رووبەڕووی مەترسیەکانی بەجیهانیکردن ببێتەوە.

مەرجی بنەڕەتیش ئەوەیە کە ڕێزی خۆی بۆ بگێڕینەوە، ڕزگاری بکەین لەو تالآوەی کە لەم سەدانەی دواییدا خواردی, بۆ ئەوەی نەخشە بکێشێت بۆ پڕۆژە شارستانییە تەواوکاریەکەی تا خزمەتی خۆیو خەڵکیش بکات. لە راستیدا ئەمڕۆ ڕۆژئاوا لە رووی تەکنۆلۆژیا پێشکەوتووەکاندا پێویستی بە ئێمە نییە, بەڵکو ئێمە پێویستمان بەوە, بەلآم ڕۆژئاوا پێویستی بە بەهاکانمان هەیە هە روەکو ئێمە پێویستمان بەوە. ئەگەر ئێمە ئەو ئامرازانەی کە بەجیهانیکردن بەکاری دەهێنی بۆ وێرانکاریی لە دووتوێی بەهاو ڕەوشتەکانمانەوە بۆ ئاوەدانکردنەوە ئاراستەی بکەین ئەوا خزمەتی خۆمانو هەموو مرۆڤایەتیشی پێدەکەین، پێش ئەوەش خزمەتی نەوەکانمانی پێدەکەینو دەیانپارێزین تا نەبنە نێچیرێکی ئاسان لە بەردەم هەڵخەڵەتێنەرەکانی بەجیهانیکردنی ئەمریکای زایۆنی بێدینیو بەرەڵآیی (اباحي).

دکتۆر عەبدولحەمید غەزالی دەڵێت: دوای ڕوخانی شۆسیالیستیو دەستپێکردنی پێرسترۆیکا لەلایەن گۆرباتشۆفەوە، کە ویستی لەو ڕێگایەوە بە دوای ڕێگایەکی جگە لە سەرمایەدارییدا بگەڕێت, چونکە شارەزاتر بوو بە گرفتەکانی، شاندێکی نارد بۆ دیراسەکردنی سیستمی ئیسلام، بە مەبەستی سوودوەرگرتن لێی، هەروەها لیژنەگەلێکیشی درووست کرد لە پسپۆڕان لە مەڵبەندی ئابووری ئیسلام لە زانکۆی ئەزهەر، ئەو لیژنانە دەستیان کرد بە بەرنامەیەکی تیۆرتەسەلی سیستمی ئیسلام, لە شێوەی بەندو بڕگەدا پێکهاتبوو لە باسی سیستمێکی ئابووری کردەیی کە بە فەلسەفەی سیستمەکەو کارو کرێو سیستمی خاوەندارێتی فرەجۆرو بەکاربردنو وەبەرهێنانو پاشەکەوتو کۆمپانیاو شێوازی وەبەرهێنانو سیاساتی دراویو دارایی‌و..تا دوا پێکهاتەی ئابووری چالاك.

کاتێ ئەم سیستمەمان پێشکەش کرد بە شاندەکە، سەرۆکەکەیان وەزیر بافلۆف پرسیی ئێوە وێنەی ئەم سیستمەتان هەیەو کەچی لەسەر ئەم حاڵەتە دواکەوتوییەن؟ کۆنگرەکەش وەڵامی پرسیارەکەیان بە من سپارد. وەڵامی منیش ئەوەبوو کە: بەڵام ئێمە بەتەواوی دوورین لەم سیستمەوە.

بەڵام ڕوداوەکانی پارچە پارچەبوونی یەکێتی سۆڤێتی بەردەوام بوو, سەرکردایەتی رووسیا هەلی بۆ هەڵنەکەوت بۆ سوودوەرگرتن لەو پڕۆژەیەی کە شاندەکەی رووسیا سووربوون لەسەروتووێژ بە درێژی لەسەری لە دانیشتنێکی تردا لە مۆسکۆ. بەڵام بەهۆی ئەو ڕوداوانەوە ئەو دانیشتنە نەکرا[2].

[1] مجلة البيان، عدد ١٥٢، ص٣٧ .

[2] المصدر نفسه، ص٧٤ .

# بەجیهانیکردن و مافەکانی مرۆڤ

لەوەی کە باسمان کرد, ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە بەجیهانیکردنی ئەم سەردەمە گەورەترین بەربەرەکانیە بەرامبەر بە ئادەمیزاد, دەیەوێت مافە بنەڕەتیەکانی لە هەموو لایەنێك لە لایەنەکانی ژیانی تاکیی و کۆمەڵایەتی لێبسێنێتەوە، دەیەوێت ئەو مافانە لە جیهانێتی برایەتی مرۆڤایەتیەوە بگۆڕێت بۆ پێشێلکردنی بەجیهانیکردن و سەرکردەکانی، لە ژێر سایەی هاوکاری, جارێك لە نێوان باکوورو باشووردا, جارێك لە نێوان دەوڵەتە دەوڵەمەندەکان و دەوڵەتە هەژارەکاندا, جارێکیش لە نێوان دەوڵەتە دواکەوتووەکان و تازەپێگەیشتووەکاندا. ئەو پەیوەندییەی کە بەجیهانیکاران دەیانەوێت بیهێننە ناو جیهانی ئەمڕۆمان, لەو پەیوەندیە ناسراوە دەچێت کە لە ئەورووپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە نێوان دەرەبەگەکان و کۆیلەکانیاندا هەبوو, دەرەبەگەکان خاوەنی زەوی و ئەو خەڵکەش بوون کە بەسەر زەویەکەوە بوون, لەو رۆژانەدا کۆیلەکان هیچ جۆرە مافێکیان نەبوو، بەجیهانیکارانیش ئەمرۆ دەیانەوێت هەموو زەویان هەبێت لەگەڵ ئەوانەی کەوان بەسەریەوە.

ئەوان بە سەرۆکایەتی ئەمریکاو دەوڵەتی ئینگلیزی جولەکە, دەیانەوێت بە تەواوی دەست بەسەر هەموو مرۆڤایەتیدا بگرن، ئەمەش لە روانگەی چەمکی ئەمریکای سەرمایەداریی تاڵی مافەکانی مرۆڤ کە بەرواڵەت جەخت لەسەر مافی سیاسیی و رۆشنبیریی دەکات, لەگەڵ پشتگوێ خستنی مافی ئابووری و کۆمەڵایەتییدا کە بە روخانی بلۆکی شۆسیالیستی کۆتایی بە باسکردنی هات.

لە نەوەدەکانی سەدەی رابردودا چەند کتێبێك دەرچوون, کە بە ئاشکرا داوایان دەکرد ویلایەتە یەکگرتووەکان هەوڵی بلاوکردنەوەی چەمکی رۆژئاوایی مافەکانی مرۆڤ بدات لە جیهاندا, لەوانەش کتێبە نوێکانی جۆشیا میرڤکایە, کە یەکێکە لە ناسراوترین تیۆرسینانی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا, باس لە جیهانێتی و تایبەتێتی بەهاو رۆشنبیریی دیموکراتی دەکات, کە ئایا توانای هەناردەکردنی هەیە؟ لەوێشدا بە ئاشکرا دەری بڕیوە کە باوەڕی وایە ویلایەتە یەکگرتووەکان دەتوانێت رۆڵێکی گەورە ببینێت لە بلاوکردنەوەی چەمکی رۆژئاوایی مافەکانی مرۆڤ لە دووتوێی دیبلۆماسیەتێکی ئارام و کۆمەکەکان و تەنانەت لە ڕێگای کاری سەربازیشەوە ئەگەر پێویست بوو[1].

ئەمەش واتای فەرزکردنی دیدی سەرمایەداریی ئەمریکایە لەسەر خیتابی مافەکانی مرۆڤ و رەتکردنەوەی هەر خیتابێکی ترە لەبارەی ئەو مافانەوە، جا ئیسلامیی یا غەیرە ئیسلامیی بێت بە توندڕەوی و دەرچوون لە دیموکراتیەت و ئازادی مرۆڤ دادەنرێت.

لێرەدا راپەڕینی گەلی فەلەستین بۆ بەرگری لە مافی زەوتکراوی خۆی لە دژی زایۆنییە جولەکە ئەمریکاییەکان لە دیدی ئەمریکاییەکانەوە دادەنرێت بە توندڕەوی و تۆقاندن کە پێویستە لەناو ببرێت. ئەوەش لە سایەی رێکەوتنەکانی ئۆسلۆدا لە نێوان جولەکەو گوایا دەسەڵاتدارانی فەلەستینی.

ئەوەی سەیرە ویلایەتە یەکگرتووەکان, رێکخراوەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان, کە بۆ بڕیاردان لەسەر مافەکانی مرۆڤ و هاوسەنگیی دادگەرانەی نێوان دەوڵەتان دروست بووە، لە پێناو گەیشتنی بە بەرژەوندیەکانی لە هەموو جیهاندا ناچار دەکات کە ملکەچی تەفسیرەکانی ئەو بۆ ئەو مافانە ببێت, بۆ بەدەستهێنانی ئەوەش ئەنجومەنی ئاسایشی کردووە بە شمشێری سەر ملی ئەو هێزانی کە بە پێوەری ئەو یاخی بوون لە یاسا, ئەو یاسایەی کە لە زۆر جێگادا خۆی پێشێلی کردووە.

هەروەها لە رەفتارەکانیدا بە دوو پێوەر کاردەکات, ئەوە بە زۆرو بە خوایشت سی دەوڵەتی کۆکردەوە بۆ دەرکردنی عێراق لە کوەیت لە کاتێکا هەتا دوای دەرکردنی عێراقیش لە کوەیت بەردەوام بوون لە لێدانی ژێرخانی شارستانیی, بۆ ئەوەی هیچ توانایەکی بۆ نەهێڵنەوە بۆ راوەستانی بەرامبەر بە دوژمنی زایۆنی*.

ئەمریکای سەرکردەی بەجیهانیکردنی ئەمڕۆ, ئەوەیە کە دانی ناوە بە ئیسرائیلدا, هۆکاری ژیانیشی بۆ دابین کردووە, بۆ ئەوەی بتوانێت عەرەب و موسڵمانان لەنابەرێت لە فەلەستیندا. تا لە کەناری رۆژئاوادا کە لە ساڵی ١٩٦٧ بە

[1] حقوق الإنسان في ضوء التجليات السياسية للعولمة، مجلة البيان، عدد ١٣٢، ص٨٠.

* لێرەدا لەگەڵ نووسەردا نیم چونکە فاشییەکانی بەغدا هیچ زیانیان بە جولەکە نەگەیاندووە قازانج نەبێت. وەرگێڕ.

ڕەزامەندی ئەمریکا داگیری کردو هانیشی دا کە تیا بمێنێتەوەو ئۆردوگاشی تێدا بکاتەوە بۆ نیشتەجێکردنی جولەکە، فەلەستینیەکانیش بێ بەکارهێنانی یەك ڤیتۆ لە ئەنجومەنی ئاسایشدا بۆ راوەستانی تۆقاندنی زایۆنیەکان لە ئاستێکدا لەناو بەرێت و دەربەدەریان بکات، ئەمەش لە سایەی بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە.

مامۆستا کامل شەریف دەڵێت: لە کاتێکا دەستە نێودەوڵەتیو هەرێمایەتییەکان دەیانەوێت ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بگێڕێتەوە بۆ ڕۆڵی سروشتیی خۆی بە پێی بەڵگەنامە راگەێنراوەکانی، یەکسەر ئەمریکا مافی ڤیتۆ بەکاردەهێنێ بۆ ڕەتکردنەوەی، بە تایبەتی لەو بڕیارانەدا کە پەیوەندی بە ئیسرائیلەوە هەیە. هەروەها بوونی ئەو ڕێکخراوە لە خاکەکەیدا یارمەتیدەرە بۆی، ئەوەبوو لەگەڵ یەکەم دەستپێشخەری سەربەخۆبوونی نەتەوە یەکگرتووەکاندا، ئەمریکا چەکی هەڕەشەی خستەکارو بەشداریی دارایی خۆی کەمکردەوە.

یۆنسکۆش بە پەرۆشەوە هەوڵی داوە کە لایەنی ڕۆشنبیریی نەخشەکانی ئەمریکا بگرێتە خۆی.کاتێ بەڕیوەبەرە گشتییە سەنگالیەکەی ئەحمەد موختار رامبۆ ویستی ڕێگایەکی بێلایەن بگرێتەبەر لە کێشەی ئیسرائیل و قودسدا، ئەمریکا بۆ دەرکردنی بەڕێوەبەری گشتیی ئەو ڕێکخراوە بەشداریی دارایی سالآنەی خۆی راوەستان[1]. ئێمە لەم لێکۆڵینەوەماندا بۆ بەجیهانیکردن دەبینین کە ئەو دەیەوێت:

١ – سەپاندنی سیستمی زۆرکاریی بەسەر گەلاندا, بۆ ئەوەی بتوانێ پرۆژەکانی هەڵبگریو ولآتەکەشی زۆر بە هەرزان بدات بەدەست ئەو نەخشەو پلانە ئابووریو سیاسیو کۆمەلآیەتیانەی کە کۆمپانیا فرەرەگەزەکانو بانقەکانیوەکو بانقی نێودەوڵەتیو سندوقی دراوی نێودەوڵەتیو دامودەزگای ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی بۆی کیشاوە.

ئایا ئەمە لادان نییە لە ماددەی ٢٠ی بەندی ٣ لە بەڵگەنامەی نێودەوڵەتی مافەکانی مرۆڤ کە دەڵێت: ئیرادەی گەل سەرچاوەی دەسەلآتی حکومەتە، ئەو ئیرادەیەش لە ڕێگای هەڵبژاردنەوە دەردەبڕێت کە لەسەر بنەمای دەنگدانی نهێنیو بە یەکسانی لە نێوان هەمووندا، یان بە هەر شێوەیەك کە ئازادی دەنگدان دابین بکات.

٢ – برسیکردنی گەلان لە ڕێگای سەپاندنی هەندێ بڕیاری ستەمکارانە لەلایەن بانقی نێودەوڵەتیو سندوقی دراوی نێودەوڵەتی بەسەر دەوڵەتە هەژارەکاندا, وەکو هەڵگرتنی پاڵپشتی پێویستیە گرنگەکانی بژێویو خزمەتگوزارییە کۆمەلآیەتییەکان, ئەوەش شێوەیەکە لە شێوەکانی ستەمو لادانی ئاشکرایە لە مافی دەوڵەتە هەژارەکان, ئەوەی کە لە مادەی ٢٥ی بەندی ٣دا هاتووە: هەموو کەسێك مافی ئاستێك لە ژیانی هەیە, کە پارێزگاری لە تەندروستیو خۆشگەزەرانی بۆ خێزانەکەی بکات, کە بریتییە لە خۆراكو پۆشاكو نیشتنگاو چاودێری پزیشکیی، هەروەها خزمەتگوزارییە کۆمەلآیەتییە پێویستەکان, هەروەها مافی دابینکردنی ژیانی لە کاتی بێکاریو نەخۆشیو کەنەفتیو پیریداو هەر شێوەیەکی لەدەستدانی کەرەسەکانی ژیان لە ئەنجامی هۆکاری بەدەر لەویستی خۆی.

ئەگەر ئامانجی بەجیهانیکردن کۆکردنەوەی سامانی دەوڵەتە هەژارەکان بێت, بە هەرچی شێوازی میکیاڤیلیانە هەیە، ئیتر چۆن بێکارییو هەژاریی بلآونابێتەوەو, بنەمای مافەکانی مرۆڤ پێشێل ناکرێت. کەواتە چی ماوەتەوە بۆ ماددەی بیستو پێنج لە مافە ئابووریو کۆمەلآیەتییو ڕۆشنبیرییەکان کە دەقەکەی دەڵێت: لەم سەردەمەدا شتێك نییە کە تەفسیر بکرێت بە لەکارخستنی مافی ڕەسەن بۆ هەموو گەلانو بەکارهێنانی سامانو دەرامەتە سروشتیەکانیو سوودوەرگرتن لێیان بە ئازادیی.

لەباتی ئەوەی بوار بدرێت بە گەلان بۆ سوودوەرگرتن لە دەرامەتەکانیان, بەجیهانیکردن دێتو کۆسپ دەخاتە سەر ئەو ڕێگایە، بۆ ئەوەی هەر خۆی سوود لەو سامانو دەرامەتە وەربگرێت, تا ئەو گەلانە بە درێژایی ساڵەهای ساڵ ئەو گەلانە بن بەژێر باری گرانی قەرزی سووداری چەنجارە.

ئەمانە هەمووی سەرەڕای بوونی ماددەی پێنجی بەندی یەك لە پەیماننامەی نێودەوڵەتی مافە مەدەنیو

[1] الشباب المسلم والعولمة، مجلة المنار.

سیاسییەکانی مرۆڤ کە دەڵێت: لەم سەردەمەدا شتێك نییە تەفسیری ئەوە بکات کە بوار دەدرێت بە هەر دەوڵەتێك یا کۆمەڵێك یا کەسێك مافی بەشداری هەر چالاکییەك یا هەرکارێکی بکات بە مەبەستی لەناوبردنی ماف‌و ئازادیە بڕیاردراوەکان لەو پەیماننامەیەدا یا سنوورداری بکات بە پلەیەکی زیاتر لەوەی لەو پەیماننامەدا دەقی لەسەر هاتووە.

ئەگەر بەڵگەنامەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان‌و مافەکانی مرۆڤ بە وردی بخوێنینەوە، دەبینین دانی ناوە بە مافی تاکەکان‌و کۆمەڵەکان‌و گەلان, لە هەڵبژاردنی ئەو ئایین‌و سیستمی کۆمەلایەتی‌و ئابووری‌و داب‌و نەریتەی کە پێی رازییە, لە چوارچێوەی ئازادیەکی تەواودا کە دەستدرێژی ناکاتە سەر ئازادیی خەڵکی تر، کەچی بەجیهانیکردن دێت بۆ ئەوەی ئەو مافانە هەموویان بسڕێتەوەو هەموو بەڵگەنامە نێودەوڵەتییەکان هەڵوەشێنێتەوە، کۆنگرە بگرێت بۆ لەناوبردنی مافە بنەرەتییەکانی ئەو هەڵبژاردنانە, وەکو لەم باسەدا بۆمان روون بوویەوە، کە هانی گرتنی کۆنگرە دەدات بۆ خێزان‌و ئافرەت لە پێناو گۆڕینی بناغەی دامەزراوە ئایینی‌و نیشتمانی‌و نەتەوەیی‌و مرۆڤایەتیەکاندا چ بە تاك‌و چ بە کۆمەڵ, هەروەها ناچارکردنی دەوڵەتان بە مۆرکردنی ئەو بڕیارانە لە ژێر چاودێریی دامەزراوەکانی نەتەوەیەکگرتوەکاندا کە ئەمان زاڵن بە سەریاندا.

بەو شێوەیە بەجیهانیکردن ماددەی سیهەمی بەڵگەنامەی مافەکانی مرۆڤ دەروخێنێ کە دەقەکەی دەڵێت: لەم راگەیاندنەدا دەقێك نییە کە لێکبدرێتەوە بە شێوەیەك کە دەسەلات دەدات بە دەوڵەتێك یا کۆمەڵێك یا تاکە کەسێك کە هەستێ بە چالاکییەك یا کارێك بکات بە مەبەستی داروخانی ئەو ماف‌و ئازادیانە.

بەجیهانیکردن لەو ئاستەشدا رانەوەستاوە، بەڵکو هەوڵ دەدات بۆ لەنابردنی سەروەریی دەوڵەت کە لە بەڵگەنامەو بڕیارو راگەیاندنەکانی نەتەوەیەکگرتووەکاندا بڕیاری لەسەر دراوەو نەگۆڕەو هەموو دەوڵەتەکانی مۆریان کردووە بە دەوڵەتەکانی بەجیهانیکردنیشەوە. بەجیهانیکردن کاردەکات بۆ گۆڕینی سەروەریی لەو دەوڵەتانەوە کە ئەندامن لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا بۆ سەروەریەکی جیهانیی، کە بەدەست کۆمپانیا فرەڕەگەزەکانەوە بێت، کە هەموو جوڵەی سیاسەت‌و ئابووری‌و دادگای بە دەستە لەو ولاتەی کە تووشی سیستمی بەجیهانیکردن بووە، یا بەوتە شیرینەکانی لە بارەی پەرەپێدان‌و هاوکاریی جیهانییەوە هەڵخەڵەتاوە، بۆ ئەوەی رێگا لە دەوڵەتەکان بگرێت کە کار بکەن بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی کۆمەلایەتی‌و ئابووری، وەکو لەو بەڵگەنامانەدا دەقی لەسەر هاتووە. کورتەی قسەشمان بەجیهانیکردن هێرشێکی تەتەری نوێیە، بۆ پێشێلکردنی هەموو مافەکانی مرۆڤ لە هەموو ئاراستەکانی ژیاندا سەری هەڵداوە. کەواتە پێویستە لەسەر هەموو گەلان‌و میللەتان‌و دەوڵەتان کە لە خەوی وەنەوشەیی خۆیان راپەڕن, بۆ ئەوەی هاوپەیمانیەك پێکبهێنن بۆ رووبەڕووبوونەوەی پیلانەکانی بەجیهانیکردن, بۆ کەمکردنەوەی مەترسیەکانی‌و سوود وەرگرتن لە ئالیەت‌و تەکنۆلۆژیاکانی, بۆ ئەنجامدانی پەرەپێدانێکی زیرەکانە کە لە بەرژەوەندی گەلانی بێت، هەروەها بۆ ئەوەی سوود لە سەروەت‌و سامانەکانیان وەربگرن، بە تایبەتی لە جیهانی ئیسلامیماندا کە پڕیەتی لە هێزو وزەو مەرجی راپەڕینی فراوان لە چوارچێوەی پلانێکی بە کۆمەڵیی ژیرانەدا بە سەرکردایەتی بنەما مرۆڤایەتییە شارستانییە ئیسلامییەکاندا کە ئەزموونی رابوردووی هەیە لە روودانی پێشکەوتن‌و گەشەپێدانێکی هاوسەنگ‌و دادگەردا.

### لە بڵاوکراوەکانی پرۆژەی (تیشک)

| زنجیرە | ناوی کتێب | نووسەر |
|---|---|---|
| ١ | بەئیسلامکردنی کورد، ماستەرنامە یان هەڵەنامە ؟ | فازڵ قەرەداغی |
| ٢ | نەزانیی و بێشەرمیی، بەشێك لە چەواشەکارییەکانی مەریوان هەڵەبجەیی لە کتێبی (سێکس و شەرع و ژن)دا | عومەر کەمال دەروێش |
| ٣ | ئاشتینامە، وەڵامێك بۆ (خوێننامە)ی زەردەشتی | ئامینە صدیق |
| ٤ | فەتواکەی مەلای خەتێ، ئەفسانەی مێژوونووسێك | حەسەن مەحمود حەمەکەریم |
| ٥ | صەلاحەددینی ئەییوبی، گەورەتر لە رەخنەگرانی، گفتوگۆ لەگەڵ پرۆفیسۆر دکتۆر موحسین موحەممەد حسێن | ئامادەکردنی: ئارام عەلی سەعید |
| ٦ | بەرەو بەختیاری ئافرەت | جەمال حەبیبوڵڵا "بێدار" |
| ٧ | ئازادیی رادەربڕین لە رۆژئاوا، لە سەلمان روشدییەوە بۆ رۆجیە گارودی | ن: د. شەریف عەبدولعەزیم<br>و: وەرزێر حەمەسەلیم |
| ٨ | بەجیهانیکردن، دیدێکی ئیسلامیی | ن: د. موحسین عەبدولحەمید<br>و: حەمەکەریم عەبدوڵڵا |